## رونكردنەوەیەكی پێویست

شۆڕشی ساڵی ١٨٨٠ی كورد بە سەركردایەتی شێخ عوبەیدوللەی شەمزینی جێگەیەكی تایبەتی هەیە لە مێژوی نوێی كوردا. هەر بۆیە هەمو ئەوانەی لەسەر مێژوی نوێی كوردیان نوسیوە، چ كوردو چ بێگانە، لەسەر ئەم شۆڕشەیان نوسیوەو، زۆربەیان بەسەرەتای دەست پێ كردنی قۆناغی نوێیان داناوە لە بزوتنەوەی رزگاری گەلی كوردا.

شۆڕشەكە، ئەگەرچی لەچەند مانگێ زیاتری نەخایاندوە، بەڵام لە سەردەمی خۆیدا گرنگییەكی ئەوەندە گەورەی هەبوە، تەنگوچەڵەمەیەكی قوڵی لەنێوان (دەربارەی قاجار)ی لەتارانو (بابی عالی)ی لە ئەستەمولدا خولقاندوەو، حكومەتەكانی بریتانیاو روسیا بایەخێكی زۆریان پێ داوەو، هەواڵو زانیاری زۆریان لەسەر كۆكردۆتەوەو،تەقەللایەكی زۆریان داوە بۆ كوژاندنەوەی، جێگەی داخە ئێمەی كورد كاتێ ئەمانەوێ لەمێژوی رابوردوی خۆمان بكۆڵینەوە، ئەبێ لەناو ئارشیفی دەوڵەتانی داگیركەرو ئیمپریالیدا بۆ بەڵگەو زانیاری بگەڕێین، چونكە لەناو كەرەستەی حۆماڵیدا بە دەگمەن هەواڵێكمان دەست ئەكەوێ.

ئەو كاتەی خەریكی ئامادەكردنی باسێ بوم لەسەر جوڵانەوەكەی شێخ عوبەیدوللەی شەمزینیو، دواتر وەكو بەشێ لە كتێبی (كوردو عەجەم) بڵاوم كردەوە، بەناو زۆر لەسەرچاوەكاندا گەڕام بۆ ئەوەی چەندی ئەكرێ هەواڵو گێڕانەوەكان لەسەرچاوەكانی دەستی یەكەمەوە هەڵ بهێنجم. هەندێ لەوانەی لەسەر ئەم شۆڕشەیان نوسی بو ئیشارەتیان دابو بە سەرچاوەیەكی ئینگیزی بەناوی (Parlamentary Papers) كە ساڵی ١٨٨١ واتە لەسەردەمی جوڵانەوەكەدا لەلایەن حكومەتی بریتانیەوە بڵاوكرابوەوە.

ئەودەم چەند هەوڵمدا بە دەستی بهێنم دەستم نەكەوت.

هاوینی ١٩٩٨ لەگەڵ هەندێ لە دۆستەكانی سەردەمی پێشمەرگایەتیمدا لە لەندەن، لەوانە برایان: رەعد فەیلیو سەعد فەیلی، دانیشت بوین سەرگەرمی باسی جۆراوجۆر بوین، ئەو كاتە من خەریكی لێكۆڵینەوەی هەندێ بەڵگەی ساڵانی بیستو سیی وەزارەتی كاروباری دەرەوەی بریتانیا بوم، باسەكەی (كوردو عەجەم)م لەبیر چوبوەوە. كاك سەعد فەیلی، كە خەریكی لێكۆڵینەوەی مێژوی كورد بو لەیەكێ لە زانكۆكانی لەندەن، لەمیانەی قسەدا ئاگاداری كردم كە ئەو بەڵگەیەی دۆزیوەتەوە. منیش هەواڵەكەم بە خۆشیەكی زۆرەوە وەرگرتو، پاش چەند رۆژێ وێنەیەكی بۆ ناردم. دوای خوێندنەوەو تاووتوێ كردنی بۆم دەركەوت كە زۆر گرنگترو پڕ زانیاریترە لەوەی من چاوەڕێم ئەكردو، ئەگەر لەكاتی نوسینی باسەكەمدا ئەم

سەرچاوەیەم لە بەر دەستدا بوایە ئەمتوانی کەڵکی زۆری لێ وەربگرمو باسەکەمی پێ دەوڵەمەنتر بکەم.

بەلامەوە نارەوا بو ئەم بەڵگانە هەروا بە نەناسراویو نەزانراوی بمێننەوە، بۆیە تکام لەکاك جەمال عەزیز کرد وەری بگێڕێ بۆ کوردیو، ئەویش بێ ئەوەی گوێ بداتە نالەباری هەلومەرجی تەندروستی خۆی، قۆڵی لێ هەڵماڵیو لە ماوەیەکی کورتدا کارەکەی ئەنجامدا. کاتێ هاوڕێیانی بەڕێزم: شێرکۆ بێکەسو رەئوف بێگەرد مژدەی دامەزراندنی (دەزگای چاپو پەخشی سەردەم)یان بۆ نوسیمو، داوای بەشداریو هاوکارییان لێ کردم، بە چاکم زانی ئەم بەرهەمەیان وەکو یەکەمین دیاری بۆ بنێرمو، بۆ ئەم مەبەستە رەزامەندی کاك جەمالیشم وەرگرت. ئەم بەڵگانە کەوا بۆ یەکەمین جارە بلاو ئەکرێنەوە کەلێنێکی گرنگ لە کتێبخانەی کوردیدا ئەگرنو چەند لایەنێکی شۆڕشەکە رون ئەکەنەوە.

بەڵگەکان زۆرنو هەمە جۆرن، رونو ئاشکران، لەبەر ئەوە بە پێویستی نازانم هیچیان لەسەر بنوسم، چونکە وەکو ئەڵێن: خۆیان قسە ئەکەن. بۆ خوێندەوارێکیش کە حەزبکا زیاتر لەسەر شۆڕشەکە بزانێ ئەتوانێ بگەڕێتەوە سەر بەشی (خەملینی هۆشی نەتەوەیی) لە کتێبی (کوردو عەجەم)دا کە ساڵی ١٩٩٢ لە ئەوروپا لە هەمان کاتدا لە کوردستان چاپو بڵاوکراوەتەوە.

لە کۆتاییدا بە پێویستی ئەزانم سپاسی کاك سەعد بکەم کە ئەم بەڵگانەی لە گۆشەی فەرامۆشی دەرهێناو، سپاسی کاك جەمال بکەم کە وەری گێڕاو، سپاسی دەزگای سەردەم بکەم کە چاپو پەخشی کرد.

**سلێمانی، سەرەتای ١٩٩٩**

**نەوشیروان مستەفا**

# نامەكاری سەبارەت بە هوروژمی كوردەكان بۆ ئێران

## ژمارە:١

لە مستەر تۆمسنەوە بۆ ئێرل گرانڤیل (لە ٢٢ی حوزەیراندا وەرگیراوە)

تاران، ١٤ مایس ١٨٨٠.

گەورەم ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە پێت رابگەیەنم كە چەندین گفتوگۆم لەگەڵ وەزیری كاروباری دەرەوەدا هەبوە دەربارەی ئەو تالانیەی خێڵە كوردەكانی دانیشتوی سنوری توركیا- ئێران كردویانەو، هانی پایە بڵندیم داوە بۆ جێبەجێكردنی رێككەوتنێكی رەسمی لەگەڵ توركیادا بۆ خستنە ژێر كۆنترۆڵی ئەم خێڵانەو رێگەگرتن لێیان لەپەنا بردنە بەر ئەو دیو سنور كاتێك كە كاربەدەستو هێزەكانی هەردولا راویان دەنێن.

پایە بڵندی دڵنیای كردم كە ئەو نەك هەر تەنها دەیەوێت، بەڵكو حەزیش دەكات كە رێككەوتنێكی ئاوها لەگەڵ بابی عالیدا بكات، وە هەر ئەوەندەی كە سەفیری توركیا لێرە دەسەڵاتی پێویستی وەرگرت بۆ گفتوگۆكردن لەسەر پەیماننامەكە، ئەوا بایەخی تەواو بە مەسەلەكە دەدات.

لە ئەستەمولەوە، بە بروسكە بە فەخری بەگ راگەیەندراوە كەوا بەم زوانە مسوەدەیەكی پەیماننامەكەی، دەربارەی ئەم مەسەلەیە پیدەگات وە دەسەڵاتی ئەداتێ تەسلیمی حكومەتی ئیرانی بكات، بەڵام بەریزی هیشتا ئەو نامەیەی پینەگەیشتووە كە لە نامەكاریەكەدا ئاماژەی پیكراوە.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە:٢

لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ مستەر گۆشن

بەریز وەزارەتی دەرەوە،١ تەمموز ١٨٨٠

لەنامەكەی مستەر تۆمسن وە لە ١٤ مایسدا كە كۆپیەكی لای خۆتانە، بەریزتان تیدەگەن كە وەزیری كاروباری دەرەوەی ئیران ئامادەیی خۆی دەردەبرێ بۆ گەیشتن بە ریكەوتننامەیەكی رەسمی لەگەڵ توركیادا بۆ سەركوتكردنی ئەو هوروژمانەی كوردەكانی دانیشتوی سنوری توركیا- ئیران كردویانە. ئەگەر مسوەدەی

ڕێکەوتننامەکــە دەربــارەی مەســەلەکە کــە دەڵێــن ســەفیری تورکیــا لـــە تــاران چاوەڕوانێتیتا ئێستا لـە بابی عالیـەوە بۆ نەنێردراوە، ئەوا دەبێ بـەڕێزتان سـوربن لەسەر ئەوەی هیچ کاتێ بەفیڕۆ نەدرێت بۆ گەیاندنی به بەڕێزی.

(ئیمزا) گرانڤیل

## ژمارە:٣

### له ئێرل گرانڤیل وه بۆ مستەر تۆمسن

بەڕێز، وەزارەتی دەرەوە، ١تەموز ١٨٨٠.

حکومــەتی خــاوەن شــکۆ خۆشــحاڵە بـــەوەی کــە بـــەهۆی نامـــەی ١٤ مـــانگی رابوردوتانـەوە ئـەوە بزانێـت کـە حکومـەتی ئـێران ئامادەیـە بـۆ بـە ئاکـام گەیشـتنی ڕێککەوتننامەیەکی رەسمی لەگەڵ بابی عالیدا بۆ دامرکاندنی هوروژمی کوردەکانی دانیشتوی سنوری تورکیا– ئێران، وە ئەوەشیان پـێ باشـە کـە ئێـوە سـورن لەسـەر ئەوەی کە وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران ئەم مەسەلەیە لەبەرچاو بگرێت.

من داوام لەسەفیری حکومەتی خاوەن شکۆ لە ئەستەموڵ کردوە کە تەقەللا بکات هیچ ماوەیەك بە فیڕۆ نەدرێت بۆ ناردنی مسوەدەی پەیماننامەکە بۆ سەفیری تورکیا گەر تا ئێستا بۆی رەوانە نەکرابێت.

(ئیمزا) ئێرل گرانڤیل

## ژمارە:٤

### له مستەر گۆشن وە بۆ ئێرل گرانڤیل– (لە ١٠ی ئابدا وەرگیراوە)

گەورەم ثیراپیا، ٣ ئاب ١٨٨٠.

نیشانە بەنامەکانی گەورەتان لە ٣٠ حوزەیرانو ١ تەمموزدا* دەربارەی مەسەلەی کوردەکـان لـە ولایـەتی واندا، ئـەز شـەرەفی ئـەوەم هەیـە کەبڵێم، زۆر کـەم مەسـەلەیەك هەبوە ئەوەندە زۆر قسەم لەسەر کردبێ لەگەڵ عابدین پاشادا ئەوەندەی پێویستیی مامەڵـەکردن بـە تونـدی لەگـەڵ ئـەم بـاندە روتکەرەوانـەداو، کۆتـایی پێـهێنان بـەو خراپەکاریەی کە دیارە هەیـە. پێش وەرگرتنـی ئـەو نامانـەی سـەرەوە کـە ئامۆژگـاریم دەداتێ بۆ پەلەکردنی مەسەلەکە لەسەر بەیاننامەکەی بابی عالی.

---

* "بڕوانە "تورکیا ژ: ٢٣ (١٨٨٠)" ژ: ١٣٧

لەو کاتەوە، من زۆر جارگەڕاوەمەتەوە بۆ ئەو راپۆرتە بەردەوامانەی کە پێم دەگات دەربارەی ئەو تالآنیانەی دەکرێن. ئەو سیستەمەی کە بابی عالی پەیڕەوی کردوە لەوەلآمدا ئەوە دەردەخات کە پێوەنانێکی زۆر هەیە بەو راپۆرتانەی کە بەمنو خەڵکی تریش دەگات، بەلآم ئەو سەرپێچیکردنانە کە رویداوە، پێویستە بخرێنە پالْ ئەو باندانەی کە سنوری ئێرانیان بەزاندوە.

من باسی پەیماننامە پێشنیارکراوەکەی نێوان ئێرانو بابی عالی سەبارەت بە دامرکاندنەوەی ئەو هوروژمانەی کوردە دانیشتوانەکانی سەر سنوری تورکیا– ئێران دەیکەن، کردوە، بەلآم وا دەردەکەوێت کە گفتوگۆکان ئەنجامێکی دیاریکراویان نەبێت گەر ئەوانە نەگوێزینەوە بۆ ئەستەمولْ.

لە هەمان کاتدا، من سورم لەسەر ئەوەی کە چالاکترین پیاو کە حکومەت بتوانێ دایبنێ، دەبێت بە تایبەتی بۆ ئەوە دابنرێ کە مامەڵە لەگەڵ گیروگرفتی کوردەکاندا بکاتو بە ژمارەی پێویستیش لەهێز پشتگیری بکرێت. هەفتەی رابوردو پێشنیازەکەم بۆ سوڵتان دوبارە کردەوە کاتێ شەرەفی دیدەنی خاوەن شکۆیم درایە.

خاوەن شکۆ پێ‌ی راگەیاندم کە پلانێك لەژێر باسدایەو لە چەند رۆژێکی کەمدا بە من دەگات. ئەو پلانە دەربارەی کارکردنی جەندرمەیە لەو ولایەتانەی لەبەر باسدان، بەلآم تا ئێستا بڕیار نەدراوە کە ئایا ئەو جەندرمانە لەسەر شێوازی هوڵەندی رێکدەخرێن یان رۆمانی. پێکهاتەیەکی ئەرکەکانی سوپاو پۆلیس خرابوە ناو سیستەمی رۆمانیەوە کە وای بۆ دەرکەوتبو کاریگەر بێت.

بەلآم پیویسترین شت لای من هەر وەك بەخاوەن شکۆشم راگەیاند، دانانی ئەفسەریکە کە پیی رابگەیەندریت کە باوەرو شەرەفی لەوەدا دەبیت کەسەرکەوتوبیت لە نەهیشتنی بێ نیزامیدا (ئاشوبە).

پیدەچو خاوەن شکۆ سور بێ لەسەر پەلەکردن لە مەسەلەکەو بەلینیشیدا کە بە خیرایی گرنگی پیبدا؛ بەلآم لەوانەیشە پیی راگەیەندرابیت کە ولایەتی وان ئارامە.

وا دەردەکەوێ ئەو رۆحیەتەی کە کاربەدەستە تورکەکان خۆیان بۆ سازداوە کە بەرامبەر ئەم کارانە بوەستنەوە هەروەك من لەم بابەتەو، لە بابەتی شیوە ئاسایی تریشدا دەیکەم، لە کۆپی بروسکەیەك کە لەناو ئەم نامەیەدایەو دوینێ دراوە بە تەرجومانی یەکەم (First Dragoman) دەخەمە پیش چاو.

ماوەیەکی زۆر نابیت، رۆژنامەیەکی تورکی بەنفوز لەیەکێ لە وتارەکانیدا باسی ئەوەی کردوە کە کوردەکان شایستەی گوێ پیدانی زۆرترن وەك لە ئەرمەنیەکان.

(ئیمزا) جۆرج جەی گۆشن

## هاوپێچی ١ی ژمارە: ٤

سەفیری حکومەتی خاوەن شکۆ شەرەفی ئەوەی هەیە کە گەیشتنی هەڵبژاردەی راپۆرتێکی حاکمی گشتی وان رابگەیەنێت دەربارەی کاروباری دەوڵەت لە باخ کاڵی کە بە بابی عالیش گەیشتوە.

بەڵام، سەفیری حکومەتی خاوەن شکۆ بەداخەوە ئەوە رادەگەیەنێ کە ئەو بیروبۆچونەی بەرێزی بۆی چوە سەبارەت بەبارودۆخی ئێستای ئەو ناوچەیە، لەراپۆرتەکانی جێگری کۆنسوڵی خاوەن شکۆ لە وان پشتگیری لێناکرێت.

ئەو ئەفسەرە رایدەگەیەنێت کە لەسەرەتای مانگی رابوردودا تێکرای دانیشتوانی سێ گوندی باخ کاڵی ئەو دەوروبەرە گەیشتونەتە وان، چونکە بەهۆی تالانی کوردەکانەوە نەیانتوانیوە لە ماڵەکانیاندا بمێننەوە، بە تایبەتی لەلایەن پیاوەکانی عەلی خان وە، وە هەروەها لە ١٨ مایسیشدا ژمارەیەکی زۆری ئاوارە لەهەمان ناوچەوە لە حاڵەتێکی زۆر نەداریدا هاتنو رایانگەیاند کە عەلی خان هێرشێکی تری کردوەو هەرچی گوند هەبو تالانی کردبو. هەروەها دەڵێت کە نێردراوێك لەئارگیشو ئەلجیفاسەوە هاتبونو ناڕەزاییان بەرامبەر رەفتاری کوردەکان لەو ناوچەیەدا دەربڕیبو. ئەوانە دەڵێن، هەرچەندە گوندنشینەکانی ئەو ناوچانە دانەوێڵەی زۆریان هەیە بەڵام تاڕادەیەك توشی برسێتی بون، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە ناوێرن دانەوێڵەکانیان ببەن بۆ ئاش نەوەك کوردەکان بیانبەن، هەروەها ئەو کوردانە خۆیان دەکەن بەناو ماڵەکاندا، راوو روت دەکەنو پەڵەو مەڕەکانیشیان لەسەر دانەوێڵە هەراشەکە دەلەوەڕێنن. دەڵێن، گەر رێگە لە لەناوبردنی دانەوێڵە هەراشەکە نەگیرێ، ئەوا ئیمساڵ هیچ بەرهەمێك نابێت، وە لەبەر ئەوەی ئەو ناوچانە شوێنی سەرەکی گەنمو جۆن ئەنجامێکی خەتەرناك دێتە کایەوە.

لە دواییشدا نێردراوێکی تر لە ئەلجیفاسەوە هاتو سکالانامەیەکی هێنابو کە تورکەکانو مەسیحیەکان ئیمزایان کردبو و قائمقامیش تەسدیقی کردبو، داوای یارمەتیان دەکرد، چونکە ئەو کوردانەی کە ناویان زازۆنلیەو لکێکی هۆزی هەیدەرانلین، هاتبونە خوارەوەو لەناو کێڵگەی دانەوێڵە هەراشەکاندا خێوەتیان هەڵدابو، مەڕەکانیان تیایاندا دەلەوەڕاندو لە هەمو لایەکیشەوە ماڵو گوندو ئاشەکانیان تالان دەکرد.

کاپتن کلایتن رایدەگەیەنێت کە رۆژانە لە هەمو لایەکەوە راپۆرتی راو و روتکردنو خراپەکاری تازەی پێدەگات لەسەر ئەو بەشەی کوردستانو، قەناعەتی خۆی دەردەبڕێ بەوەی کە مەترسیەکی زۆر هەیە کە ناوچەی زۆر لەلایەن ئەو کوردانەوە بەفیڕۆ بچێت.

وا پێدەچێ کە مەترسی زۆر، بە تایبەتی لە ئەختەماردا هەبێت، چونکە کوردەکانی ئەو نزیکانەی بەردانی سەرۆکەکانیان کە عابدین پاشا گرتبونی، زۆر

هانی دابونو لەو باوەڕەدا بون کە لەوانەیە لەو کاتەدا بتوانن بە (حصانەوە) پەلامار بدەن.

راپۆرتی داوە کە گوشاری برسێتی لەزیادبوندایەو نرخی دانەوێڵەش لەچەند رۆژێکی کەمدا نزیکەی دو هێندی لێ دەرچوە، کومسیونەکانیش زانیاریان پێگەیشتبو کە موتەسەریفی موش دانەوێڵەی عەمبارەکانی حکومەتی داوە بە موفتیو قازیو دەوڵەمەندو خەڵکانی بەنفوزی تر، کەچی گەنمی بەسەر هەژاراندا دابەش نەکردوە، وە سەبارەت بەناردنی ئەوەی کە لەوانیشەوە لێی داواکرابو، کۆسپی دروستکردووە.

بەهۆی هەلومەرجی ئەم مەسەلانەوە، سەفیری حکومەتی خاوەن شکۆ گومانی لەوەدانیە کە بابی عالی بە پێویستی دەزانێ فرمانی توند بۆ فەرمانبەرەکانی لەوان بنێرێت کە هەنگاوی پێویست بنێن بۆ پاراستنی دانیشتوانە بێوەیەکانی دژی زوڵمی کوردەکانی دراوسێیانو بۆ خۆشی خەڵکە ستەمدیدەکە.

ئەو کاتەی ئەوەی سەرەوە دەنوسرا، بروسکەیەکی کۆنسوڵی حکومەتی خاوەن شکۆ لە ئەرزڕۆم کە بەم دواییانە سەردانی وانی کردوە، گەیشت. لە بروسکەکەدا دەڵێت کوردەکان نزیکەی بیست گوندی کوردو مەسیحیان لەناوچەی هەکاری لەو سێ مانگەی رابوردودا تالانکردوە، سێهەم دوا هوروژمیان لە ٢٠ حوزیرانی رابوردودا رویدا. ئەو بە پێویستی دەزانێ کە کاربەدەستە ئێرانیەکان هان بدات بۆ رێگەگرتن لە کوردەکان کە لە سنور نەپەڕنەوە، لەبەر ئەوەی هێزەکانی تورك ئەوەندەنین کە رێگە لە پەلامارەکان بگرن.

مەیجەر ترۆتەر لەسەری دەرواتو دەلیت، کاتی دانانو پیکهینانی جەندرمە لە ولایەتە تازەکەی بەتلیسدا گۆردراوە تا سالی داهاتو، ئەویش بەهۆی پیویستی پارەوە؛ شەست دیل لە زینداندانو بەتاوانی گەورە تاوانبارکراونو هیچ دادگایەکیش نیە کە دادگاییان بکاتو، برسیتیش هیشتا خەلك زۆر لەناو دەبات لە ناوچەکانی باش قەلا، بایەزیدو هەکاریدا.

حکومەتی خاوەن شکۆ متمانەیەکی زۆری هەیە بەوەی کە بابی عالی بتوانێ پیشانی بدات کە ئەوەندەیان هیزو دەسەلات هەیە کە بتوانن بە خیرایی مامەلە لەگەڵ ئەم حالەتە ناهەموارەدا بکات، ئەوەی کە تازەترین لەو زانیاریانەی بە بروسکە گەیشتون، پیشانی ئەدەن کە گۆرانکاری روئەدات.

(ئیمزا) جی. جەی گۆشن　　　　　　ثیراپیا، ٢١ حزیران ١٨٨٠

## هاوپێچی ٢ی ژماره: ٤

**له حەسەن پاشاوه بۆ قەدری پاشا**

**(بە بروسکە) ٢٤\١٢ تەمموز ١٨٨٠**

**بروسکەی ٢ی تەمموز ( ) وەرگـــیرا. بـــەپێی فەرمانـــەکانی پایەبەرزتان، راسپاردەی پێویستم ئاراستەی موتەسەریفی هـەکاریو قایمقامـەکانو سەرۆك هۆزەکان کردوه. لەهەمان کاتداو بەشێوەیەکی تایبەتی داوام لـە موتەسەریف کردوە کە بە شەخسی بڕوات بـۆ ناوچـەکان کـە بونـی تیایـاندا پێویسـتەو گرنگـی تایبـەتیش بـە راگرتنـی نـیزامو سـەلامەتی خـەڵکی بـدات. سـەرەڕای ئـەوەش، مـن لەڕێگەی بەکرێگیراوی شوێن متمانەوە، بەزمانێکی پاراو ئاگاداری سەرۆك هۆزەکانو خەڵکی تریشم کردۆتەوە کە بە گوێرەی پێویستیەکانی بارودۆخەکە لەو ناوچانەدا خۆیان لەو کارانە بپارێزن کە دەبێتە هۆی ناڕازیبون.**

**سوپاس بۆ خوا کە لـە ویلایەتەکەدا تـا ئێستا هیـچ شـتێك روینـەداوە شـایانی باسـکردن بـێ. ئێسـتاش، زیـاتر لەهـەمو کاتـێ، کەسـانی نیـەت خـراپ هەوڵئـــەدەن ئاساییترین شت زل بکەن. ئێمە هەوڵئـەدەین سروشـتو گرنگـی هـەر حاڵـەتێك بـەبێ دواکەوتن بڵاوبکەینەوە.**

**بەو جۆرە، لەشەوی پێنج شـەممەی رابوردودا دەنگە دەنگێکی گـەورە پـەیدا بـو دەربارەی کارێك کە جەردە ٨٠٠ سەر مەڕی لە گێدی کلێسە کـە دو سـەعات لـەوان وە دورە، دزیبو. ئەم راپۆرتە، تەنانەت لە کۆنسوڵی روسیش بیستراوە. هەر بـە خێرایی، دو تابور نێردرا بۆ شوێنەکە بۆ لێکۆڵینەوە.**

**لەگەڵ ئەوەشدا، بە پێی شـایەتی قەشـەکانی کلێسـە کـە ئێسـتا ژمـارەی مـەڕە دزراوەکـان کەمکراوەتـەوە بۆ ٣٠ دانـە. ئـەم سیسـتمی پێوەنانـە، بـەگرنگی پێـدان بـە روداوێکی بچوکەوە، پشتگیری لەوە دەکات کە شـەرەفی ئـەوەم هـەبێ ئـەوەی سـەرەوە بە پایەبڵندت رابگەیەنم.**

## ژماره: ٥

**له ئێرل گرانڤیل وه بۆ مستەر گۆشن**

**بەڕێز وەزارەتی دەرەوە، ١٩ ئاب ١٨٨٠.**

**نامەکـەی رۆژی ٣ی ئـەم مانگـەی بـەڕێزتانم وەرگـرت، کـە ئـەو رونکردنـەوە دوپاتکراوانەم پێرادەگەیەنێت کە بۆ بابی عالیتان کردوە بەوەی کە کۆتایی بە تالانی کوردەکـانی سـەر سـنوری تورکیـا– ئـێران بـهینرێتو، بـە تـەواویش ئـەو تێبینیـە دەسەلمێنێ کە بەڕێزتان ئاراستەی عابدین پاشاتان کردوە لەسەر مەسەلەکەی ٢١ی**

حزیرانو، لەهجەی بەڕێزیشتان بۆ سوڵتان بەو بۆنەیەوە لەدوا چاوپێکەوتن لەگەڵ خاوەن شکۆیدا.

(ئیمزا) گرانڤیل

## ژمارە: ٦

لە ئێرل گرانڤێل وە بۆ مستەر گۆشن– (لە ٢٤ی ئابدا وەرگیراوە)

(هەڵبژاردە) ثیراپیا، ١٧ی ئاب ١٨٨٠.

دەربارەی مەسەلەی پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی کوردی، لە پەترياركی ئەرمەنیەکانەوە بروسکەیەکم پێگەیشتوە، وا هاوپێچ بە ئەسڵی بۆ زانیاری بەڕێزتان دەینێرم.

## هاوپێچی ژمارە: ٦

وان، ٢٠ جون ( ) ١٨٨٠.

ئیتر هیچ گومانێك نەماوە. خەریکە کۆمەڵەیەکی کوردی لەسەر تەفرەدانی حکومەتی مەرکەزی پێك دێت کە دەخوازێت مەسەلەی ئەرمەنیەکان دابمرکێنێتەوە بە ڕێگەی پێکهێنانی یەکێکی تازە کە هی کوردەکانە.

ڕۆحی ئەم کۆمەڵەیە، سیاسەتی عوسمانیە. شێخ عوبەیدوللە بەناو ناوەندەکەیەتیو؛ بەحری بەگیش پەیامبەرە لێوەشاوەکەی.

وروژاندنێك لە ئارادایە. بەحری بەگ دەچێت بۆ لای سەرەك خێڵە کوردەکانو هەندێ جار بەڵێنیان دەداتێ، هەندێ جار استعطاف، وەهەندێ جاریش هەڕەشە بەکار دێنێت بۆ یەکخستنی هەمویان لەدەوری یەك سەرۆك هەمان سەرۆك کە شێخ عوبەیدوللەیە.

بۆ ئەوەی کۆمەڵە کوردیەکە ولاتێك لە تورکیادا دروستبکات، دڕندەترین چالاکی دەکات تاوا لە ئەرمەنیەکان بکاتە ناوچەی ئاغباغ (هەکاری) جێهێڵن. بەم دیدەوە، هەمو جۆرە خراپەکاریەك دەکات کە هێورکردنەوەی بێ سودە.

بڕوانە، چەند کەسانێکی شوێن متمانە چۆن لە ئاغباغەوە دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەنوسن:

"کاتێ بەحری بەگ وەك هەڵگری میدالیای دەوڵەت کە حکومەتی عوسمانی پێی بەخشیبو هات بۆ ئاغباغ، ئەم وتەیەیدا: "من دەعوەتی شێخ دەکەم کە بچێت بۆ

ئەستەموڵ؛ گەر بەرهەڵستی بکات، ئەوا منیش لای خۆمەوە بە هێزەکانی ئیمپراتۆریەتەوە دەکشێمە سەری".

"لەگەڵ ئەم قسانەشدا، بەحری بەگ هەر ئەوەندەی گەیشتە لای شێخ، نەك هەر تەنها سەرۆك کوردەکانی ئەرمینیای بانگ کردە لای شێخ، بەڵکو ئەوانەی ئێرانیشی بانگ کرد.

"مەمیی کوڕی عەلی خان بەیاوەری پیاوەکانی، سوێندیان بۆ شێخ خواردوەو بەدیاریەوە گەڕاونەتەوە. سەرۆك هۆزی تریش، لە یەکەم یاخیبوندا، لەگەڵ شێخدا خۆیان دیەوە.

"وێڕای ئەمانەش، چەند سەرەك خێڵێك وەك عەبدولرەحمان جیهانگیرو، کیرۆت عەلی مەحمود تا ئەم کاتەش سەرباری هەمو تەقەللاکانی بەحری بەگ دانیان بە کۆمەڵەدا نەناوە، هەرچەندە هەمو گریمانێك هەیە کە دەچنە ناوی.

"بەحری بەگ هەروەها دەعوەتی خێڵەکانی میلان، ئەلکانو دو دەری ئێران کردوە کە بێنو بچنە ژێر رکێفی شێخەوە.

"ئەم کۆمەڵەیە، ئێستا ٤,٠٠٠ هەزار تفەنگی مارتینی هەیە، کە ٢٠٠ دانەیان ئێرانیەو ئەوەشی ماوە تورکیە.

"حکومەتی عوسمانی، لە بۆ بەرزکردنەوەی حورمەتی رەگەزی کورد لە ئەوروپادا، هەوڵی نائاسایی ئەدات بۆ تەفرەدانی بزوتنەوەی هاوزەمان لە تورکیاو ئێراندا، کە ئەندامەکانی کۆمەڵە دەخوازن ناوەندێکی تری ئۆپوراسیونو کۆنترۆڵکردن لەنێوان ئاسمەو سەلماسدا پێکبهێنن.

"موتەسەریفی ئاغباغ (هەکاری) کە ئەم بزوتنەوەیە تۆقاندویەتیو لەوانەیە کاردانەوەکەشی هێشتا لای حکومەتەوە پێ نەگەیشتبێت، دەخوازێت دەست لەکار بکێشێتەوە.

"بەهۆی بەهانەی جیاوازەوە، بەحری بەگ دەخوازێ بچێت بۆ وان بۆ ئەوەی کوردەکانی ئەو ویلایەتە هان بدات بچنە ناو بزوتنەوە گشتیەکەوە. ئاگاداری ئەوەش ببە کە ئەم کۆمەڵەیە لە هەمو شوێنێك لکی هەیە.

لە راستیشدا، هەندێ لەسەرەك هۆزەکانی تورك لە وان لەبیری ئەوەدان کە واز لە شارەکە بهێنن شێخ کۆنترۆڵی بکات. بەهەرحاڵ ئێمە لەو باوەڕەدا نین کە کوردەکان بوێرن تا ئەو خاڵە بڕۆن.

گرنگی سیاسی ئەم کۆمەڵەیە هەرچەنێك کەم بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە ئەنجامی خراپی هەبێ لە فریودانی دانیشتوانە ئەرمەنیەکاندا کە ئێستا ژیانو ماڵو موڵکیان لە مەترسیدایە.

فەرماندەی فەیلەقەکەی سوپا بەچاولێپۆشینی حاکمی وان ئەم لەشکرکێشیانە جێبەجێدەکات.

بەبۆچونی ئێمە، بەلانانی ئەم دو کارە گەورەیە، باشترین ئامرازە بۆ پەکخستنی ئەو نەخشانە کە مەخابن زۆر لە چونە پێشەوەدان.

سەرباری ئەمانەش، هەر ئەوەندەی بڕیارە بەرزەکەی پەیماننامەی بەرلین جێبەجێ دەکرێ، کوردەکان کە لە تورکەکان زیرەکترن، دەتوانن بەهۆی ئەو نەرمیەی کە تایبەتە بە خەسڵەتیان، چاکتر کاربکەن وەك لەوەی خۆیان وابەستە بکەن بە ئەرمەنیەکانیەوە.

## ژمارە: ٧

لە مستەر گۆشن وە بۆ ئێرل گرانڤیل– (لە ٣١ی ئابدا وەرگیراوە)

گەورەم، ثیراپیا، ٢٣ی ئابی ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپێچ کۆپی نامەیەکی سەیرت بۆ بنێرم کە ئاراستەی جێگری کۆنسوڵی حکومەتی خاوەن شکۆ لە وان کراوە دەربارەی بیروبۆچونو سیاسەتو فێڵی شێخ عوبەیدوڵڵەی کوردەوەو، وەزعی نەستۆریە مەسیحیەکانیش لە کوردستاندا.

## هاوپێچی ژمارە: ٧

لە جێگری کۆنسوڵ، کلایتون وە بۆ مەیجەر ترۆتەر

بەڕێز باشقەلا، ١١ تەمموز ١٨٨٠.

ئەو کاتەی گەیشتمە ئێرە، توسون پاشای موتەسەریف پێی راگەیاندم کە ماوەیەك بەر لە ئێستا ئەفسەرێکی ناردوە بۆلای شێخ عوبەیدوڵڵە لەگەڵ فرمانی وسامەکەیدا وە لەنێو گفتوگۆکردن لەگەڵئەفەسەرەکەدا شێخ گوتویەتی "ئەمە چیە من دەیبیستم، گوایە ئەرمەنیەکان دەیانەوێت وڵاتێکی سەربەخۆیان لە واندا هەبێ، وە نەستوریەکانیش بەنیازن بەیداخی بەریتانیا بەرزبکەنەوەو خۆیان بەرەعیەتی بەریتانی دابنێن. من هەرگیز رێگە نادەم تەنانەت گەر پێویست بکات ژنانیش چەکدار بکەم". لەهەمان کاتدا شێخ ناردویەتە لای مار شەمعونو داوای لێدەکات بداتە پاڵی دژی حکومەتی تورکو، هەمان داواشی لەسەرەك قەشە ئەرمەنیەکانی ئێرە کردوەو پێی گوتون کە ئەو مەسیحیەکان دەپارێزێ. هەروەها وای لە گوندنشینەکان کردوە، تەنانەت ئەوانەش کە ماوەی چوار سەعات لە باشقەلاوە دورن، کە بەڵێن بدەن باجی بدەنێ.

هەروەها پاشا دەلێت شێخ ویستویەتی کورەکەی بنێریت بۆ ئەستەموڵ لەگەڵ ئەم پێشنیارانەی خوارەوەدا. شێخ بری گەورەی پارە دەستنیشان دەکات کە لە ریگەی بەدرخان بەگەوە دەدریت بە سولتان کاتێ نیمچە سەربەخۆ دەبێو، هێشتا بری گەورەتریش دەدات گەر دان بنریت بە دەسەڵاتی بەسەر کوردستانداو دەستیش نەخریتە کاروباریەوە.

زۆر ئاشکرا دیارە کە شێخو رەنگە کوردی تریش زۆر بە توندی دوشمنکار بن بەرامبەر هەر مافیك کە بە ئەرمەنو نەستۆریەکان دەدریت. لەهەمان کاتدا، شێخ دەخوازیت کە خۆی بکاتە میری فعلی کوردستانو دەیەویت نەستۆریو ئەرمەنیەکان دژی حکومەتی تورك کۆمەکی بکەنو، هەروەها دەسەڵاتی خۆشی بەسەر کوردەکاندا بسەپێنیت کە بەهیچ شیوەیەك جیگیر نیە لەبەر ئەوەی دو خیلی بەهێز دژی وەستاونو، کورە گەورەکەی خۆیشی دوژمنایەتی لەگەلدا هەیەو ئیستا لە ئیرانە. سەرباری ئەوەش، هەرچەندە لەوانەیە کوردی تریش بۆ ماوەیەك لە گەلیدابن. بەڵام ئەگەر توشی تیکشکانیك ببیت، وە یان ئەگەر سەربکەویتو هەولی سەپاندنی دەسەڵاتی توند بدات بەسەریاندا، ئەوا لیی دەکشینەوە.

بەشیوەیەکی گشتی، شتیکی بەلگە نەویستە کە ئۆتۆنۆمی وە یان حکومەتی نیابی لەم کاتەدا تەواو لە شوینی خۆیدا نابێ لەم جیگایانەدا، وە ئەوەی پیویستە دەسەڵاتیکی بەهیزە لەدەستی پیاویکی بە توانادا کە شوین متمانەی ئەوروپا بیت. بەڵام من هەروەها زۆر دلنیام لەوەی کە پیویست دەکات تا رادەیەك حکومەتە ئەوروپاییە سانەویەکان کۆمەکی بکەن.

دەمەویت سەرنج بۆ راستیەکیش رابکیشم، کە ئەو پەیوەندیە توندو تۆلەی کە لەم ولاتانەدا هەیە لەنیوان بنەما ئایینیو سیاسیەکانداو، ئەو وتوویژانەی کە لەم دواییەدا بەردەوام بو لەنیوان نەستۆریەکانو کلیسە ئینگلیزیەکاندا، بونەتە هۆی باوەریکی بەربلاو لەنیوان نەستۆریەکان خۆیانو رەگەزەکانی تریشدا کە نەستۆریەکان لە هەندێ شیوازی تایبەتەوە شایستەی پاریزگاری لیکردنن لەلایەن ئینگلستانەوە؛ لە راستیدا، ئەوەی کە ئەمانە بە فعل رەعیەتی بەریتانیان، باوەریکە لەلایەکەوە رو لە ئیدیعای نەستۆریەکان دەکاو دەبیتە هۆی وروژاندنی غیرەت لەنیوان ئایینو رەگەزە جیاوازەکانداو، هەروەها ئەو بێ متمانەییەی کە تورکەکان بە ئینگلستانیان هەیە.

(ئیمزا) ئیمیلیەس کلایتن

## ژماره: ٨

**لە کۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وە بۆ ئیرل گرانڤیل (لە ٧ی ئەیلولدا وەرگیراوە)**

**هەلبژاردە. تەوریز، ٣١ی تەمووز ١٨٨٠.**

**ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە لەگەڵ ئەم نامەیەدا، کۆپی سێ نامەو یەك هاوپیچتان بۆ رەوانە بکەم کە ئاراستەی وەزیری مفوض خاوەن شکۆ لە تارانم کردوە، دەربارەی ئاشوبەکانی سەر سنوری تورکیا– ئیرانو کردەوەکانی شیخ عوبەیدوڵڵەی سەرۆکی کوردەکان. مەسەلەی کورد، ئەوەی کە خیرو خۆشی هەزاران ئەرمەنیو مەسیحیشی پیوە پەیوەستە، زو یا درەنگ سەرنجی ئەوروپا رادەکیشیت. ئەمەش مەسەلەیەکە چەند رویەکی هەیە. من لەم تەرەفەی سنورەوە بە بایەخەوە چاوەدیری کاریگەریەکانی دەکەم؛ بەڵام لەناو خودی تورکیادایە کە پیویستە ئیمە بەدوای ئەو هۆیانەدا بگەریین کە ئیستا لەژیر دەسەڵاتی شادا لەکاردان.**

## هاوپیچی (١)ی ژمارە: ٨

**لە کۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وە بۆ مستەر تۆمسن**

**بەریز، تەوریز، ١٤ تەمموز ١٨٨٠.**

**ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە ئەوە رابگەیەنم کە لە ١١ی ئەم مانگەدا هاوکارە تورکەکەم چاوپیکەوتنیکی لەگەڵ والیدا هەبو بۆ ئەوەی بارودۆخی کاروبارە ناتەواوەکانی سەر سنوری تورکیا– ئیران، نزیك بە باشقەلا رون بکاتەوەو، بەدوای ئەوەشدا بروسکەی بۆ نوینەری بابی عالی لە تارانو پاشای وان کردوە.**

**وا دەردەکەوێ کە کوردەکانی شکاكو هەیدرانلو هوروژمیکی درندانەیان بۆ ناو تورکیا کردبێ؛ بەڵام لەلایەکی تریشەوە کاربەدەستە ئیرانیەکان نارەزایی ئەوە دەردەبرن کە چەند خیلیك لە تەرەفی تورکیادا ئەم کیشانەیان دروست کردبێ. بەواتایەکی تر کۆچرەوەکان کە دلسۆزن بۆ شاو تارادەیەکی زۆریش سونین هاو مەزهەبەکانیان لە وڵاتی عوسمانیدا تەئسیریان هەیە لەسەریان، بە هەیبەتو ترسەوە دەروانننە شیخ عوبەیدوڵڵەی سەرۆکە روحیەکەیان لە هەردو دیوی سنورەکەدا.**

**من لەو باوەرەدام، کە نیاز وایە جەنەراڵ کوبی خان لە تەوریزەوە بنیردریتەوە سنور، کە رەنگە نیردراویکی بابی عالیش چاوی پێ بکەویت بۆ دانانی چارەسەریك بۆ ئەم کیشەیەی ئیستا، بەڵام خان خۆی پیی راگەیاندم کە ئەوەندە سور نیە لەسەر هەلسان بەو کارە، چونکە ئەنجامیکی باشی نابیت ئەگەر حکومەتی ئیران بەشیوەیەکی ریکوپیك کۆمەکی نەکەن.**

بیگومان دوژمنایەتی سنوری ئیستا لەنیوان تورکیاو ئیراندا چارەسەرناکریت- وەك ئەوەی کە من لەم سێ سالەی دواییدا دیومە کراوە- کە چەند مانگیکی کەم لە ئیستا بەدواوە جاریکی تریش هەلدەگیریتەوە؛ شتیکی ئاشکراشە کە ئەنجامیکی هەمیشەیی نایەتە دەست بۆ هیورکردنەوەی سنور تاکو ئەو دو زلهیزە بەشیوەیەکی رەسمی پەیماننامەیەکی تایبەت بۆ ئەو مەبەستە نەبەستن. بە هەر حالْ، من مەترسی ئەوەم هەیە کە لەم کاتەدا جیاوازییە تائفیەکان وایان لیبکات نەتوانن بە روحیەتیکی پاکەوە مەسەلەیەکی ئاوها لیکبدەنەوە.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپیچی (٢)ی ژمارە: ٨

### لە کۆنسۆلی گشتی، ئابوت وە بۆ مستەر تۆمسن

بەریز، تەوریز، ١٥ تەمموز ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە پیتان رابگەیەنم کە وا پیدەچێ ئەو هەلویستەی کە بابی عالی سالی پار هەیبو بەرامبەر سەرۆکی کوردی یاخیبو شیخ عوبەیدوالله، کاری ئالۆزی ترسناکی لی بتەنیتەوە.

لەبری ئەوەی حکومەتی تورکیا سزای توند بەشیخ بگەیەنێ بۆ شۆرشەکەی، دیاریو خەلاتی پیداوەو، ئیستاش پرۆژە لەبەرچاوەکەی دور لە سزادان، بە ئاشکرا جیبەجی دەکات.

من دەزانم کە شیخ لە هەردو دیوی تورکیاو ئیراندا گوند دەکرێ کە نفوزی زۆری پێ پەیدا دەکاتو، هەروەها توانیویشیتی خیلی شکاك کە وەلایان بۆ شا هەیە، بەشیوەیەکی لەبەرچاو بخاتە ژیر رکیفیەوەو خۆشیان بە تفەنگی مارتینی چەکدار کردوە.

لەم دواییانەدا، کورەکەی شیخ لەگەلْ هیزیکی سەربازی تورکدا سەردانی بازارگاریان کردوە. ئەم شوینە بریتیە لە دۆلیك لەنیوان گەوەرو برادۆستدا، لەکۆندا خیزانی جولەکەی لی نیشتەجێ بون، بەلام ئیستا کەلاوەنو نزیك خالێ سنورن. مەبەست لەم جموجولەش یان بۆ خۆپیشاندانیکی چەکدارانە دژی عەلی خانی سەرۆك شکاکەکان بوە، وە یان بۆ دروستکردنەوەی دیوارە روخاوەکانی بازارگار بوە.

بەهۆی بەرهەلستکارکردنی شیخەوە، حکومەتی ئیران ناتوانێ نوینەریك لەمەرگەوەر دابنیت. سەرۆك خیلەکانی شنۆو لاهیجان مسکینو پیاوەکانی شا- لە

گفتوگۆدان بۆحالەتیکی سەربەخۆ کە وایان لیبکات بەکردار ببنە هاوپەیمان لەگەڵ شیخدا.

ئەم کارانە وا دانراون کە دەسەڵاتی شا لەنیو رەعیەتە خیلەکیەکانیدا هەلتەکینن.

بۆچونی من ئەوەیە کە شیخ خواستەکانی پارتە مورتەجەعەکەی تورکیا جیبەجێ دەکاتو، دەبیت جوڵانەوەکەی لە نزیکەوە چاوەدیری بکریت، چونکە لەوانەیە ببیتە کۆسپ لەریگەی هەردو حکومەتی ئیرانو تورکیادا.

من لەو باوەرەدام کە شیخ بلیسەی تەعەسوب بە زیندویی لەنیو موسولمانەکاندا دەهیلیتەوەو، گەر کردەوەکانی رانەگیریت ئەوا جاریکی تریش دەبیتە کارەساتیك بۆ دانیشتوانە مەسیحیەکانی نزیکی، هەروەك ئەوەی لەو جەنگەی دواییدا کردی.

ئەوەی زۆر نەویستە ئەوەیە کە ریگەی بدرێ نفوزی لە ئیراندا بلاوببیتەوەو، منیش ئەو بۆچونەم بۆ کاربەدەستە ناوجییەکان دەربریوە.

بیگومان، لەئاکامی ئەو ریگەیەی ئەو پەیرەوی دەکات، حکومەتی ئیران- هەروەك لەنامەی ژ: ٣٨ی دوینیمدا باسکراوە ئەسلی پیشیویەکانی ئیستا ناو سنور بۆ خاکی تورکیا دەگیریتەوە.

## هاوپیچی (٣)ی ژ: ٨

### بۆ کۆنسوڵی گشتی، ئابۆت

هەلبژاردە ورمێ، ٨ی تەمموز ١٨٨٠.

شیخ عوبەیدوالله لە ریزی ئەکلیرکی ئیسلامدا، خۆی بە سیهەم کەس دادەنێ. هەروەها بیجگە لە چەند خیلیکی کەم کە بەناو رەعیەتی ئیرانن، شیخ مەلیکی سیڤیلی مەقبولو دانپینراوی هەمو کوردانە. بەشیوازیکی شایانە دەژێ، رۆژانە ٥٠٠ بۆ ١٠٠٠ میوانی هەمو جۆرە چینەکان لە مالیدا میوانداری دەکرین. شۆرەتو شەخسەیتی بە ئاشکرا جیاوازە لەوەی کە لە کاربەدەستە ئیرانیو تورکەکاندا دەبینرێ. خۆی وەیان کورەکەی، بەشەخسی هەمو ئەو کەسانە دەبینن کە بۆ کار دین، وە گرنگیش نیە ئەو کارە هەرچۆنیك کەمو بێ بایەخیش بێ. ژیانی مالەوەی زۆر ساکارترە. ئەلکهول هەرگیز ناچیت بەشارەکەیدا.

لە بەیانیەکی زوەوە تا درەنگانیکی شەو خۆیو میراتگرەکەی بە بەرژەوەندی حکومەتو میللەتەکەیەوە خەریکن.

میللەتەکەی شیخ ریزو خۆشەویستی زۆریان بۆی هەیە، بەلام لەهەمان کاتیشدا ناویرن گویرایەلی نەبن. ئەوان دەلین حاکمو قازیەکی عادلە. هەرگیز بەرتیل

وەرناگرێو ریگەش نادات بە فەرمانبەرەکانی وەریبگرن. هەر کەسیك لە یاسا لابدات، حوکمی مردنی دەدریت.

شیخ زیرەکەو بە پەرۆشیشە کـە بتوانـێ دەربـارەی ئایدیـاو ژیـانی شارسـتانی بزانێ.

شیخ هەولئـەدات میللەتەکـەی بکاتـە هـاولاتیو دزو جـەردەو تـالانی نـەهیلیت. بـۆ ئەمەش زەوی کشتوکالی لە گەوەر، باشقەلا، مەرگەوەر، وە تەرگەوەر دەکرێ.

کورەکـەی شـیخ کـە نـاوی عـەبدوالقادرەو مـیراتگریتی، ئیسـتا لیرەیـە. رەنگـە مەبەستی هاتنەکەی کە پیشنیارەکە لەجیاتی باوکی، بخریتە بـەردەم حکومەتـەوە. شیخ دەلیت کوردەکانی شـکاکی ژیـر نفـوزی عـەلی خـان، هەرکیـەکانی ژیـر نفـوزی حەسەن بەگ، پیکەوە لەگەڵ ژمارەیەك بەگی تردا کە هەمو بەناو رەعیـەتی ئیرانن، بـە بـەردەوامی کاروانـە ئیرانیـەکانو ئەوانـەی کـە سـەر بەویشـن، روت دەکەنـەوە. ئەوانـە هەروەها رەعیەتەکانی شیخو ئەوانەی ئیرانیەکانیش بەبێ جیاوازی دەکوژن. ئەو زۆر جار داوای لـە حکومـەتی ئیران کـردوە کـە سـزایان بـدات وەیـان ریگـەی ئـەو بـدات سزایان بدات، بەلام هـەرگیز گوێی لی رانـەگیراوەو داواکەشـی سـەیر نـەکراوە. شـیخ دەخـوازێ ئیسـتا هـەر سـێ دەشـتەکەی مەرگـەوەر، تەرگـەوەر وە برادۆسـت کـە کەوتونەتە نیوان ورمێو سنوری تورکیاوە، سالانە بە بریك پارە پیی بدریت بە کرێو، بەلینیش ئەدات کە لەهـەر تالانیـەك کـە لەناوچەکـەدا دەکریـت، بیانپـاریزیت. شـیخ گوتویەتی، گەر ئەمە رەفز بکریتو رەعیەکانی بە بەردەوامی تـالان بکریـن، ئەوا یاسا دەخاتە دەست خۆیەوەو ئەم خیلانە بە تەواوی لەناو دەبات. چەند حەفتەیەکی کەم لەمەوبـەر، کورەکـەی بـە تـۆپو سـوپایەکەوە هـات بـۆ برادۆسـت بـۆ ئـەوەی شـەری شکاکەکان بکات، بەلام عەلی خان بەلینی دلسۆزی (ولاء) بۆ شیخ داو بەو پییەش وەك رەمزیك کورەکەی خۆیو ١٠٠ پیـاویکی دەرەجـەداری نـارد بـۆ ریزلینـان لـە شـیخ. شـیخیش گوندیکـی کریـو لـە برادۆسـت قەلایـەکی لـەنیوان زەویـەکانی شـکاکو هەرکیەکاندا دروستکرد.

## ژمارە: ٩

لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل- (لە ٥ی تشرینی یەکەمدا وەرگیراوە)

گەورەم، تاران، ٢٤ی ئاب ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە رایبگەیەنم کە بەردەوام بومە لەسەر هاندانی حکومـەتی ئیران بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ کاربەدەستە تورکەکاندا بۆ پاراسـتنی نـیزام لـەنیوان خیلە کوردەکانی دانیشتوی نزیك سنوری ئیران.

وەزیری کاروباری دەرەوە دلنیای کردوم کە ئەو زۆر بە دلسۆزیەوە دەخوازیت ئەوەندەی لە توانادابیت یارمەتی حکومەتی تورکیا بدات بۆ جیبەجیکردنی هەر ئیجرائاتیك کە حەزبکەن بیکەن بۆ کۆتایی پیهینانی جموجۆلی بێ یاسایی ئەم خیلانە. بەلام ئەو تیبینی داوە بەوەی کە کاتێ هەر ئاژاوەیەك لەناو تورکیادا نزیك بە سنور روئەدات، ئەوا کاربەدەستە تورکەکان بەشیوەیەکی نەگۆر تەقەللا ئەکەن وای پیشان بدەن کە ئیران لەرودانی بەرپرسیارەو، بۆ نۆ لەدەی ئەو حالەتانەشدا، زۆر بە ئاسانی لە ئەنجامی نەرمی خۆیانەوە بوە. وا خۆی پیشان نەئەدا کە خیلە ئیرانیەکان ئەوەندە زۆر گوناهبارن وەك ئەوانەی تورکیا سەبارەت بەو ململانێ ئاساییەی سەر سنور کە بە بەردەوامی روئەدا، وە کە دەبوە مشتومرو داوا بۆ چاککردن لە هەردولادا. بەلام سور بو لەسەر ئەوەی کە هەمیشە ئیران لەم جۆرە روداوانەدا ئامادەتر بوە لە تورکیا بۆ لیکۆلینەوەو بژاردن. بۆ ئەمەش چەندین نمونەی هینایەوە، کاتێ لەو سالانەی دواییدا ئیران بەو شیوەیە کاری کردبو، بەلام تورکیا کەللەرەقانە هەمو چاککردنیکی بارودۆخەکەی رەفز کردبو.

لە پشتگیریکردنیدا بۆ ئەم بۆچونە، نیشانەی بەو لیژنەیەدا کە ئیستا لە سنوری ئازەربایجانە بۆ لیکۆلینەوە لەو گازندانەی کە خیلە ئیرانیو تورکەکان دژ لەیەك کردویانەو؛ گوتی، هەر ئەوەندەی کە نیردراوە ئیرانیەکە، قولی خان، کە ئیستا لەسەر سنور چاوەروانی فەرمانبەرە تورکەکەیە بۆ بەشداری کردن لە لیکۆلینەوەکەدا، راپۆرتەکەی دەنیریو ئەو زەرەرانە پیشان ئەدات کە ئەم خیلانە گەیاندویانە، حکومەتی ئیران ئەو زەرەرانە دەبژیرێ کە بەدەستی رەعیەتەکانی کراوە.

سەبارەت بە مسوەدەی پەیماننامەکە کە جەنابتان لەنامەی ۱ی تەمموزدا نیشانتان پیدابوو، لە ریگەیەوە پیشنیارتان کردبو کە حکومەتەکانی تورکو ئیران ریککەوتننامەیەکی رەسمی بکەنو پەنا نەدەن بەهیچ خیلیکی کورد کە لەو بەر سنورەوە داوای پەناهەندەیی دەکات کاتێ بەهۆی خراپە کاریو تاوانەوە لەلایەن کاربەدەستەکانی خۆیانەوە راودەنرین، پایە بلندی پیی راگەیاندم کە حکومەتی ئیران هیشتا ئامادەیە بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ریککەوتنیکی ئاوها لەگەلْ بابی عالیدا، بەلام لەو باوەرەدایە کە هەندێ کیشە لەروی ئەو پەیماننامەیەدا بەرز بۆتەوە، بەوەی کە سەفیری تورکیا لیرە بۆ ماوەیەك نەدەچو بەلای ئەوەدا کە وتوویژ بکاتو، هیچ شتیکی بەپەلەش نەبو کە بگەیەنریتە دەرئەنجامیك.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن.

## ژ:١٠

### له مستەر تۆمسن وه بۆ ئیرل گرانڤیل
### له (٨ تشرینی یەکەمدا به بروسکه وەرگیراوه)

گەورەم،                                                        تاران، ٨ ت١ ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیه که بۆ زانیاری جەنابتان رایبگەیەنم، ژمارەیەکی زۆر له کوردەکان وەك راگەیەندراوه ١٥,٠٠٠ کەس بەهێزی سەر بە خێلی هەمە جۆرو دانیشتوی هەردولای سنوری تورکیا – ئێران، بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدوالقادری کوری شێخ عوبەیدوالڵەی سەرۆکه ناودارەکەی تورکیاو سەرۆك خێلیکی ئێران بەناوی حەمزاغا، دەوری شارو ناوچەی سابڵاخ یان گرتوه.

به نزیك بونەوەی کوردەکان کاربەدەستە ناوجییه ئێرانیەکان هەڵاتنو، وا باس دەکریت که کوردەکان ئیستا ماوەیەکی کەم چوبیتنه پیشەوه بۆ شارۆچکەی مەرەگە که کەوتۆته نیوان نزیکەی نیوه ریگای سابلاخو تەوریزەوەو، چەندین له گوندی ئەو نزیکانەیان تالاّن کردوه.

حکومەتی ئێران فەرمانی بۆ هێزەکانی لەپادگانی تەوریز دەرکردوەو هەروەها بۆ ناوچەکانی ئەو دەوروبەره کە لەشوینی ئاژاوەکاندا کۆببنەوەو، فەرماندەیی ئەم هێزانەش سپێردراوه به حیشمەت الدولە، میر حەمزه میرزا کە ئیمرۆ پایتەخت جێدەهێلیّو کاری فەرماندەیی وەردەگری واباس دەکریّ، ئەو هێزەی لەژێر فرمانیایەتی ١٢,٠٠٠ پیاو بن، کە بریتین لە هێزی نیزامیو نانیزامی لەگەڵ دو بەتارییەی تۆپخانەدا.

فەخری بەگی سەفیری تورك لیره، لەگەڵ کاربەدەستە تورکەکانی واندا پەیوەندی کردوەو داوای کردوه کە هێزەکانیان لەگەڵ هێزەکانی خاندا هاوکاری بکەن، بۆ ئەوەی کاتێ کوردەکان له خاکی ئێرانەوه دەرپەرینران، ریگەیان لی بگیریت تا لەناو سنوری تورکیادا پەنایان پی نەدریّ.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژ:١١

## لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل
## (بە بروسکە لە ١١ تشرینی یەکەمدا وەرگیراوە)

گەورەم، تاران، ١١ ت١، ١٨٨٠.

ئەم بەیانیە شا پەیامیکی بۆ ناردم، دەلیت حەزدەکات بمبینیت. بەو پییە رۆیشتم بۆ کۆشكو خاوەن شکۆ دەستی کرد بە قسەکردن دەربارەی سەرهەلدانی کوردەکان لە ئازربایجان. خاوەن شکۆ گوتی ئەوە تەواو شتیکی سەرسورمینەر بوە بۆی؛ چونکە ئەو لەو باوەرەدا بوە کە لە رۆژئاوای سنوری مەملەکەتەکەیەوە دراوسییەکی شارستانی هەیە کە هەمیشە توانیویتی نیزام لە مالەکەی خۆیدا بپاریزێو، هەردو هیزو ویستیشی هەبوە کە ریگە لە کۆمەلی (تاقمیّ) چەکداری درندە بگریت سنور نەبەزینن بۆ سوتاندن، روتکردنەوەو کوشتن، ئەو چاوەروانی نەکردوە کە رەعیەتەکانی سولتان لە رۆژئاوادا رەفتاریان وەك تورکومانەکان بیت لە رۆژهەلاتدا.

لەم کاتەدا، ئامادە نەبو بۆ جولانەوەیەکی ئاوها گەورەو چاوەروانکراو و، بەو پییەش داوای لیکردم کە تازووە داوایەکی جدیی ئاراستەی حکومەتی خاوەن شکۆ بکەم کات بە فیرۆ نەدەن سەبارەت بەو راستیەی کە وەك یەکیك لەهیزە ناوبژیکەرەکان ئامۆژگاری سەفیری حکومەتی خاوەن شکۆ لە ئەستەمولْ بکات بۆ ئەوەی بە توندی تەئسیر لە حکومەتی تورکیا بکات کە بەشیوەیەکی پیویستو پەلە، هاوکاری لەگەلْ ئیراندا بکەن بۆ راگرتنی ئەم بزوتنەوەیەی کوردستان.

خاوەن شکۆ پیشنیاری کرد کە دەبیّ بابی عالی هەرەشە لە شیخ عوبەیدوالله بکات کە رەعیەتیکی تورکیایە، یان بە بلاوکردنەوەی هیزیکی سەربازی وەیان هەر شیوەیەکی تر، بەو پییەش ناچار بکریت عەبدوالقادری کوری کە یەکیکە لە سەرکردەکانی بزوتنەوەکە لەناو ئیراندا، بانگ بکاتو خۆشی واز لەو نیازە دوژمنکاریە بهینیت کە ئیستا لەبیریدایە بەرامبەر ئیران.

خاوەن شکۆ هەروەها لەو باوەرەدا بو کە دەبیّ بابی عالی هەندیّ ئیجرائاتی عەسکەری لەسەر سنور بکات بۆ ئەوەی ریگە لە کوردەکان بگرن کە لە سنورەوە دەکشینەوە کاتیّ هیزەکانی ئیران پەلاماریان ئەدەن. گەر هەمو شتیك جیبەجیّ بکریت بە خیراییکردن لە قایمکردنی هیزەکان لە ئازربایجاندا، ئەوا رەنگە نەتوانن بۆ مانگیکی ترلە هەمان شویندا بمیننەوەو خاوەن شکۆش زۆر مەترسی ئەوەی هەبو کە لەوانەیە روسیا سود لەو دواکەوتنە وەرگریّ بۆ ئەوەی بەشیوەیەکی کاریگەر دەست

تیوەردان بکاتو بەهانەی سەلامەتیو بەرژەوەندی رەعیەتە  زۆرەکانی لە ئازەربایجان بهێنیتەوە کە حکومەتی ئیران نەیتوانیوە بیانپاریزیت.

دەستیوەردانیکی ئاوها لەلایەن روسەکانەوە، خاوەن شکۆ، روسیاشی بیتە سەر؛ وەك یەك کوشندە دەبێ بۆ ئیرانو تورکیاش.

من وەڵامم دایەوە کە بەخیرایی بروسکە بۆ جەنابتان دەکەم، بەو رادەیەی  خاوەن شکۆ دەیخوازێ، بەڵام گوتیشم،  لەبەر رۆشنایی ئەو راستیەی کە شیخ عوبەیدوالله پیشتر بەسەرکەوتویی بەرامبەر دەسەڵاتی بابی عالی وەستاوە،  من بەهەرحالێ بو بێ دلنیابوم لەوەی کە ئەو گوشارەی دەیخەنە سەری، کاریگەریەکی زۆری دەبێ.

خاوەن شکۆ پیی راگەیاندم کە کوردەکان لەراستیدا نەچوبونە  ناو مەرەغاوە وەك راپۆرت درابو، بەڵام گوندەکانی  ئەو دەوروبەرەیان بەتاڵان بردبو و بەرەو لای باشور کشابونەوە.

سەبارەت بەو  هیزانەی کە لەبەردەست دەسەڵاتدارەکانی ئازاربایجاندان، خاوەن شکۆ پیی راگەیاندم کە سێ فەوج لەناوچەکەدانو، پینجی تریش  داواکراون. هەموی تیکرا ١٠,٠٠٠ کەس لە تارانو شوینەکانی ترەوە دەنیردرین بۆ بەهیزکردنی ئەو هیزانەی ئیستا لە ئازەربایجانن، ئەم بەهیزکردنانە یەکیك لە فەوجە تازەکانو بە تارییەیەکی تۆپخانەیان بە تفەنگەوە تیادایە، ئەوانەی کە لەم دواییانەدا لەلایەن ئەفسەری نەمساویەوە راهینراونو، چواریشیان لەگەڵ هیزەکەدایە. هەروەها دو بەتارییەی تۆپخانەی کۆنی ئیرانیشی لییە.

بەپیی ئەم یەکەم راپۆرتانەی گەیشتونە ئیرە، شۆرشگیرە کوردەکان ١٥,٠٠٠ کەس دەبن، بەڵام حکومەتی ئیران مەزەننەیان بە ٧.٠٠٠ کەس دەکات.

حاجی میرزا حوسەینی کۆنە وەزیری کاروباری دەرەوە، بۆ تەوریز دانراوەو، بەرپرسیاریەتی ناوچەکە لەژیر ناوی میراتگری شەرعیدا وەردەگرێ. بیگومان، ئەم دانانە بۆتە هۆی نارەزایی دوژمنە زۆرەکانی وەزیری پیشو، لەبەر ئەوەی باش دەزانن کە لەم بەریوەبەرایەتیەیدا  سەرکەوتو بێ، ئەوا گریمانی گەرانەوەی بۆ دەسەڵات لە ماوەیەکی کەمدا دور نابیت.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژماره: ١٢

**له عاسم پاشاوه بۆ موسو روس بەگ– (له ١٥ تشرینی یەکەمدا له موسوروس بەگەوه بۆ ئیرل گرانڤیل نیردراوه)**

**به بروسکه                ئەستەموڵ، ١٤ی ت١، ١٨٨٠.**

**به بابی عالی راگەیەندراوه، کورەکەی شیخ عوبەیدوالله که چەند ساڵیك لەمەوبەر پەنای بۆ ئیران بردوه، خۆی ئاماده دەکات پیشەوایی باندیك بکاتو بۆ مەبەستی تالانی بچیتە ناو خاکی عوسمانیەوه. حکومەتی ئیمپراتۆریەت کە ناتوانێ چاوەدیری راگرتنی نیزامو سەلامەتی خەلکەکە نەکات، ئیجرائاتی بەپەلەو کاریگەری کردوه بۆ پاراستنی ئەو خەلکەی که هوروژمەکانی ئەم تاقمه هەرەشەیان لیدەکاتو، بۆ پاراستنیان له هەر تالانیەك، به پەلەو به ژمارەی پیویست هیز بۆ سنور نیردراوه.**

**من بەباشم زانیوه که ئەوەی رویداوه بۆت بنیرم، بۆ ئەوەی له حالەتی پیویستدا بتوانیت راستیەکەی بۆ ئەوانەی دەورت باس بکەیت.**

## ژماره:١٣

**له ئیرل گرانڤیل وه بۆ مستەر تۆمسن**

**بەریز،                وەزارەتی دەرەوه، ١٦ی ت ١، ١٨٨٠.**

**لەریگەی قائم بالاعمال ی بالیۆزخانەوه لیره، حکومەتی بابی عالی رونی کردەوه که کورەکەی شیخ عوبەیدوالله خۆی ئاماده دەکات بۆ پەلاماردانی ناوچه تورکیەکان لەخاکی ئیرانەوه که بۆ چەند ساڵیك دەچێ پەناهەندەیه لێی، وه ئیجرائاتی کاریگەریش بۆ راگرتنی نیزام جیبەجی کراوه.**

**(ئیمزا) گرانڤیل**

## ژماره: ١٤

**له مستەر گۆشن وه بۆ ئیرل گرانڤیل– (له ١٩ تشرینی یەکەمدا وەرگیراوه)**

**گەورەم،                ثیراپیا، ١٢ی ت ١، ١٨٨٠.**

## هاوپێچی ١ی ژمارە: ١٤

**لە کاپتن کلایتن وە بۆ مستەر گۆشن**

**بەڕێز،** **وان، ٥ی ت١، ١٨٨٠.**

**وا ڕاگەیەندراوە کە شیخ عوبەیدوالله لەگەڵ ٥٠٠ کەسدا دژی حکومەت کشاوەو زابتیەکانی ئیرەش مانیان گرتوە لەبەر ئەوەی موچەیان نەدراوەتێ. حکومەت شەلەلی توش بوە. کوردەکان لەهەمو شوێنیکدا هەن.**

## هاوپێچی ٢ی ژمارە: ١٤

**بەڕێز،** **بەغداد، ٨ی ت١، ١٨٨٠.**

**ڕاگەیەندراوە کە شیخ عوبەیدوالله لەگەڵ هەزاران کوردا لە سنور پەڕیوەتەوەو گەیشتۆتە ورمێ. وا باسدەکریت کە چەند هەزار نەستۆریەك کوژرابن.**

## ژمارە: ١٥

**لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ مستەر گۆشن**

**بەڕێز،** **وەزارەتی دەرەوە، ١٩ی ت ١، ١٨٨٠**

**نیشانە بە نامەکەم لەیەکی تەمموزدا، نامەیەکی وەزیری مفوضی حکومەتی خاوەن شکۆ لە تاران بۆ بەڕیزت ڕەوانە دەکەم، کە ئەو وتو ویژەی تیادایە کە لەگەڵ وەزیری کاروباری دەرەوەی ئیراندا کردویەتی بۆ ڕاگرتنی نیزام لەنیو ئەو خیلە کوردانەی لەسەر سنوری تورکیا– ئیران نیشتەجین.**

**بەڕیزتان لەنامەکەی مستەر تۆمسن وە تیدەگەن کە وەزیری مفوض تورك لە تاران هیچ پیشکەوتنیکی لەگەڵ ئەو پەیماننامەیەدا بەدەست نەهیناوە کە پیشنیار کرابو بۆ دانوستاندن لەگەڵ حکومەتی ئیراندا بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە؛ وە منیش داوا لەتۆ دەکەم کە هەلیکی باش برەخسینی بۆ هاندانی بابی عالی بۆ پیویستی پەلەکردن لە بەئاکام گەیاندنی ئەم ریککەوتنە.**

**(ئیمزا) گرانڤیل**

## ژمارە: ١٦

**لە مستەر گۆشن وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٢٦ی تشرینی یەکەمدا وەرگیراوە)**

**گەورەم، ثیراپیا، ١٩ی ت ١، ١٨٨٠.**

**نیشانە بە نامەکەی رۆژی ١٢ی ئەم مانگەم، ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپیچ کۆپی بروسکەیەکت بۆ رەوانە بکەم کە سەفیری ئیران لیرە بەمنی داوە، سەبارەت بە هوروژمی کوردەکان بۆ ناو ئیران.**

**(ئیمزا) جۆرج. جەی گوشن**

## هاوپیچی ژمارە: ١٦

**لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئیرانەوە بۆ سەفیری ئیران لە ئەستەموڵ**

**بە بروسکە**

**دو کوری شیخ عوبەیدوالله کە دانیشتوی هەکارینو حەمزاغای مەنگور کە بە کەسایەتی خراپ ناسراون، لەگەڵ چەند سەرۆکیکی تاقمی تالانکەری گەرۆك وەك خۆیان، هەلساون بە چەندین کاری تالانیو ویرانکردنی هەمەجۆر لە لاڤۆنچو مەرەگەدا. بۆ ریگەگرتن لە راپەرین، هیز نیردراوە بۆ سزادانی سەرپیچی کەران. رەوشتو سروشتی درندانەی کوردەکان لەم ناوچەیەدا، لەلایەن دەرەوە نەزانراوە. ئەم راپەرینە هیچ گرنگ نیە. شتیکی ئاساییە کە دەبینین ئەم کوردانە هیچ ئامانجیکیان نیە تەنیا تالانی نەبیت. هەر ئەوەندەی هەوالی نزیکبونەوەی هیزەکان هات، ئەم تالانچیانە روەو مەرەگەی ئەو نزیکانە هەڵاتن.**

## ژمارە: ١٧

**لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(لە ١٧ی تشرینی یەکەمدا بە بروسکە وەرگیراوە)**

**گەورەم، تاران ٢٧ی ت ١، ١٨٨٠.**

**ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بە جەنابتان رابگەیەنم، کە هەفتەی رابوردو مستەر ئابۆت ورمێی جیهیشتوە بەنیازی گەرانەوە بۆ تەوریزو، ریگەی لەو چونەی لیگیراوە لەبەر ئەوەی ریگاکان لەدەستی کوردە یاخیبوەکاندایە.**

**نامەیەکی مستەر ئابۆتم لایە بە بەرواری ٧ی ئەم مانگە، تیایدا رونی دەکاتەوە کە ئەو کاتە شارەکە لەلایەن کوردەکانەوە بەهۆی دو هیزەوە لەژیر مەترسیدا بوە، هەریەك لەو هیزانە کوریکی شیخ عوبەیدوالله فەرماندەی بوەو، بەشیکی ١٠٠٠**

کەسی بەهیز بە فەرماندەیی شیخ سادق سەنونی داگیرکردوە لە ٢٤ میل لە ورمیٚوە دورە لەسەر ریگە سەرەکیەکەی سنورو، ئەویتریشیان کە بە فەرماندەیی شیخ عەبدوالقادر بوە دەستیکی بالاٌی هەبو لەناوچەکانی مەرەگەو سابلاٌخدا.

بەپیی زانیاری‌یەکانی ئەو دواییەی لە تەوریزەوە هاتوە، ئیستا وا دەردەکەویت کە شیخ عەبدوالقادر دوای ئەوەی شارۆچکەی میاندواوی تالاٌن کردوەو دانیشتوانەکەشی بەشمشیر کوشتون، ریٚی کردوە بۆ تالاٌنکردنی دیهاتەکانی دەوری مەرەگەو، ژمارەیەکی زۆر لە گوندی ئەو نزیکانەی ویرانکردوە، بەلاٌم بە نزیکبونەوەی هیزە تازەکانی کە حکومەتی ئیران ناردبونی، لەو بەشەی ناوچەکە پاشەکشەی کردبو و کشابو بۆ ورمیٚو، بە گەیشتنیشی بۆ ئەویٚ خەلکەکەی بانگ کردبو تەسلیم بین.

## ژمارە: ١٨

لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل

(لە ٢٨ی تشرینی یەکەمدا بە بروسکە وەرگیراوە)

گەورەم، تاران، ٢٨ی ت ١، ١٨٨٠.

نیشانە بەنامەکەم بە بەرواری ئیمرۆ ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بە جەنابتان رابگەیەنم، کە ئیستا هەوالٌ گەیەندراوە کە کورەکانی شیخ عوبەیدوالله‌و برایەکی هەمزاغای سەرەك خیلی کوردی ئیران بە گوللە لەو پیکادانەدا کوژراون کە چەند رۆژیٚ لەوەبەر لە نزیك مەرەگە رویداو، ئیعتماد السلطنەش توانیویتی وا لە کوردەکان بکات روەو سابلاخ بکشینەوە.

پاشا خانی حاکمی خۆی، بەهیزە تازەکانەوەو بە یارمەتی هیزەکانی ورمیٚ، رۆژی یەك شەممە گەیشتنە سەلماس وە بەپیی دوایەمین هەوالٌ

## ژمارە: ١٩

لە مستەر گۆشن وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە کاتژمیری ١٠,١٥ی پاش نیوەرۆی ٢٩ی ت ١، وەرگیراوە)

گەورەم، ڤیراپیا، کاتژمیر ١٢,١٠ ی پاش نیوەرۆ، ٢٩ ت ١ ١٨٨٠.

لەوان وە راگەیەندراوە کە حاکمی سورەیا رایکردوەو، شیخ عوبەیدوالله‌ش سنوری بەزاندوە بۆ ناو ئیران.

## ژماره: ٢٠

**لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(لە ٣٠ی تشرین یەکەمدا بە بروسکە گەیشتوە)**

**گەورەم، تاران، ٣٠ی ت ١، ١٨٨٠.**

**نیشانە بە بروسکەی جەنابتان لە ١٦ی ئەم مانگەدا، ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە پیتان رابگەیەنم کە ئەو وتارەی لیرەدایەو قائم بالاعمالی (چارج دو ئەفیر) بالیۆزخانەی تورك لە لەندەن داویتی، لەگەڵ دیدو قسەکانی شیخ عوبەیدوواللەدا ریك ناکەویت، هەروەك لەو نامانەیدا کۆکراونەتەوە کە بەم دواییانە ئاراستەی ئیقبال الدولەی حاکمی ورمیّو میسیونەرە ئەمریکیەکانی ئەو شوینەی کردون، بۆ ئەوەی لەریگەی مستەر ئابۆت وە بۆ حکومەتی خاوەن شکۆ رەوانە بکرین.**

**لەم نامانەدا، شیخ عوبەیدوواللە بە راشکاوی دەلیت کە مەبەست لە ناردنی کورەکەی بۆ ئیران، وەدەستهینانی ریگەچارەیەکە بۆ گازندەی کوردەکان؛ شیخ دەلیت کوردەکان لەلایەن تورکیاو ئیرانەوە بەشیوەیەکی زۆر خراپ بەکارهینراون؛ ئیستا خۆیو سەرەك خیلەکانی کوردستان دەخوازن کوردستان لەسەر بنچینەیەکی یەکگرتو و سەربەخۆ دابمەزرینن.**

**(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن**

## ژماره: ٢١

**لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(بە بروسکە لە ١ تشرینی دوەمدا گەیشتوە)**

**گەورەم، تاران، ١ی ت٢، ١٨٨٠.**

**نیشانە بە نامەکانی پیشوتان سەبارەت بە چونە پیشەوەی یاخیبونی کوردەکانەوە، ئیستا ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بە جەنابتان رابگەیەنم کە حکومەتی ئیران لە تەوریزەوە بروسکەی پیگەیشتوەو تیایدا هاتوە کە کوردەکان لە ورمیّ کشاونەتەوە. هەروەها باسیشکراوە کە ململانیّو دوبەرەکی لەنیوان سەرۆك کوردەکاندا کە ئیستا خەریکی جۆرە ریکەوتنیکن لەگەڵ کاربەدەستە ئیرانیەکاندا، رویداوە**

**(ئیمزا) رۆنالد. ف تۆمسن**

## ژماره: ۲۲

**له مستەر گۆشن وه بۆ ئیرل گرانڤیل– (له ۲ی تشرینی دوەمدا وەرگیراوه)**

**گەورەم،                ڤیراپیا، ۲٤ی تشرینی یەکەم، ۱۸۸۰.**

**ئەز شەرەفی ئەوەم هەیه که هاوپیچ کۆپی نامەیەکی مەیجەر ترۆ تەرت بۆ رەوانه بکەم که تیبینی تیادایه سەبارەت بەو هەولەی واتەواتی لەسه ربلاوبۆتەوه بۆ پیکهینانی کۆمەلەیەکی کوردی.**

**(ئیمزا) جۆرج جەی. گۆشن**

## هاوپیچی ژماره: ۲۲

**له مەیجەر ترۆتەرەوه بۆ مستەر گۆشن**

**بەریز،                ڤیراپیا، ۲۰ی ت ۱ی، ۱۸۸۰.**

**داوام له کاپتن کلاینتن کردوه که هەر زانیاریەکی سەبارەت بەوەی که ناوی دەبرێ به کۆمەلەی کوردی چنگ کەوت، به رەسمی بۆم رەوانه بکات.**

**نیشانه بەواتەواتی بونی کۆمەلەیەکی کوردی، که تا رادەیەك حکومەتی تورکی ریکی خستوه، بۆچونی من ئەوەیه که تەنها له خەیالی چەند ئۆرگانیکی رۆژنامەوانی ئەستەمولدا هەیه.**

**تا ئیستا، سیاسەتی تورکیا، هەمیشه بەگژاکردنی خیلیك دژی یەکیکی تر بوەو، ئەو شۆرشانەی کوردستانیش که له دو سالی دواییدا رویانداوه، له هەمو حالەتیکدا بەیارمەتی سەرەك هۆزی تری کورد دامرکینراونەتەوه.**

**من به شەخسی به ئاگام لەوەی که هەلچونیکی زۆر لەنیو کوردەکاندا هەیه، بەهۆی نیشانه دان به مەسەلەی ئۆتۆنۆمی ئەرمەنیەکان که زۆر باسکراوه. هاوینی پار له وان، چەندین کاربەدەستی بەرز دەربارەی مەسەلەکه قسەیان بۆ من کردو، سەرەك کوردەکانیش بۆ خۆیان له گفتوگۆکانیاندا دەربارەی مەسەلەکه لەگەڵ مندا نیشانەیان بۆ کردوه. گریمانیکی زۆر هەیه که ئەگەر ئیمتیازیکی نائاسایی به ئەرمەنیەکان بدریتو کوردەکانی لیدەرکریت، لەوانەیه کوردەکان دژی مەسیحیەکانو حکومەتیش یەکبگرن که کاریکی ئاوها ئەنجام ئەدات.**

**لەوانەیه ئەو یەکبونه به قەتلوعامی مەسیحیەکان له شوینه دورەکاندا تەواو ببیت که مەسیحیەکان ناتوانن هیچ بەرهەلستیەك بکەنو حکومەتیش هیزی نابیت ئەگەرچی ویستیشی هەبێ که ریگەی لیبگریت.**

شتیکی بەلگەنەویستە کە بە نفوزترین کەس لە رۆژهەلاتی کوردستاندا شیخ عوبەیدوالله‌یەو، شەخسی خۆیو دەسەلاتی لەناو کوردەکانی سنوردا زۆر لەوەکانی سولتان پیرۆزترە. گومان لەوەدا نیە کە ئامانجی ئەم پیاوە رزگارکردنی ولاتەکەیە لە کاربەدەستەکانی سولتانو، دانانی خۆی بە حوکمداری کوردستان کە پیکهاتوە لە بەشیکی باشوری وانو بەشیکی باکوری ولایەتی موسلو زیاتریش بە هەمو لایەکدا ئەوەندەی کە بتوانیت نفوزی فراوان بکات. بۆ جیبەجیکردنی ئەم کارەی، سیاسەتی ئیستای راکیشانی مەسیحیەکانە بەلای خۆیدا نەك لە خۆشەویستی یان لە ریزەوە بۆیان، بەلکو وەك ئامرازیك بۆ جیبەجیکردنی خواستەکانی.

شیخ، تەنها سەرۆکی موحتەمەلە بۆ کۆمەلەیەکی کوردی، لەگەل ئەوەشدا، من دەزانم کە هەندێ سەرەك هۆزی کوردی بە نفوز تا مردن دژی دەوەستن؛ وە هەرچەندە دەسەلاتی تا ئەو بەر سنوری ئیران فراوان بوە، بەلام لەبەشی رۆژئاوای کوردستاندا نفوزی لەدەست داوە.

رەنگە چونە ناوەوەی ئەم دواییانەی شیخ بۆ ناو ئیران بەهۆی ئەو بۆچونەوە بوبیت کە حکومەتی ئیرانی زۆر بۆگەن تر بو لەوەی تورکیاو، وەدەستهینانی دەسەلاتیکی سەربەخۆ، لەوێ ئاسانتر دەبێ وەك لە تورکیادا. هەر ئەوەندەی ئەوە وەدەستهینرا، هیزە زۆر زیادبوەکەی دژی فەرمانبەرە عوسمانیەکان بەکاردینیت.

من بەمەبەست زاراوەی "فەرمانبەرە عوسمانیەکان" بەکاردینم، نەك دەسەلاتی سولتان، چونکە لەو باوەرەدام کە شیخ، زۆر یا کەم بە شەخسی بەوەفایە بۆ سولتانو؛ ئامادەیی مل کەچیە بۆ دەسەلاتیو ریزی لیدەگریت، مادام ئەو فەرمانبەرە عوسمانیەکانی لە کۆل دەبیتەوەو، وەك ئەمریکی واقعو یاسایی بە سەرۆکی فەرمانرەوایی کوردستان سەیر دەکریت.

من لەو باوەرەدام، شیخ کوری شیخ زەهارە، کە شیخیکی زۆر بەناوبانگی تر بوەو لە سالی ١٨٤٣دا هاندەری سەرەکی بە کۆمەل کوشتنی نەستۆریەکان بوە لە لایەن بەدرخان بەگەوە لە بۆکتان. هەروەها، لە سالی ١٨٦٩دا، شیخ عوبەیدوالله لەلایەن کونسۆل تایلەرەوە راپۆرتی لەسەر درابو بەوەی یەکیك بوە لە هاندەرە سەرەکیەکانی پەلامارە توندەکاندا بۆ سەر مەسیحیەکان لەو بەشەی ناوچەکانی نزیکیەوە. لەلایەکی تریشەوە، من گەیشتومەتە ئەو قەناعەتەی کە لەماوەی دوا جەنگدا، شیخ کە چەند هەزار موتەطوعیکی هینابوە ناو سوپای تورکەوە، لەکاتی کۆمەلکوژیەکەی بایەزیددا نفوزی خۆی بەکار هینا بۆ مەسیحیەکانو ژمارەیەکی زۆریان لە تیاچون رزگار کرد.

گەر حکومەتی بابی عالی دانا بن بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆیان، ئەوا ئەم هەلەی ئیستا دەقۆزیتەوە بۆ لەناوبردنی شیخ، چونکە تا لە ولاتەکەی خۆیدا بمینیتەوە، دەبیتە درك لە کەلەکەیاندا.

(ئیمزا) هینری ترۆتەر

## ژمارە: ٢٣

لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل

(لە ٢ی تشرینی دوەمدا بە بروسکە گەیشتوە)

گەورەم، تاران، ٢ی ت ٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بە جەنابتان رابگەیەنم کە خاوەن شکۆ شا، زۆر بە پەرۆشە بۆ ئەوەی رونکردنەوەی زیاتر لەلایەن حکومەتی خاوەن شکۆوە بۆ بابی عالی بکریتو، هانی حکومەتی عوسمانی بدریٚ لە نزیکترەوە چاوەدیری سنوری تورکیا-ئیران بکات بۆ ئەوەی ریگە لە کوردەکان بگیریٚ ئەم دیوو ئەو دیوی سنور بکەن. هەروەها خاوەن شکۆ داوای پیویستی دەرکردنی ئەمریکی بانگهیشان (استدعاء) ئەکات لای بابی عالیەوە کە ئاراستەی شیخ عوبەیدوالله بکریتو داوای لیبکات بگەریتەوە بۆ ناو خاکی تورکیاو وەلای خۆی بۆ سولتان تازە بکاتەوەو، بلاوی بکەنەوە کە ئەگەر مل دانەنەوینیٚ، وا توندترین ئیجرائاتی بەرامبەر دەکریت بۆ ئەوەی گویٚ رایەلٚ بیت.

تا ئیستاش لەلایەن شیخەوە، بەیانی وروژینەر لەناو کوردەکاندا بلاو دەکریتەوەو، بەم دواییانەش نوینەریکی نهینی ناردوە بۆ تاران، بەنامەیەکەوە بۆ عەباس میرزای برای شا، داوای لیدەکات کە بەشداری لە بزوتنەوەکەی ئیستای کوردستاندا بکات.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ٢٤

لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ مستەر گۆشن

بەریز، وەزارەت، ٢ی ت ٢، ١٨٨٠.

نامەکەی ١٢ی ئەم مانگەتم پیگەیشت، زانیاری باشو بەسودی دەربارەی مەسەلەی یاخیبونی کوردەکان مەرکەزی شیخ عوبەیدوللەی تیادابو.

له حاله‌تی  دانانی كۆمیسیۆنیك له‌لایه‌ن توركیاو ئیرانه‌وه بۆ سه‌ردانی سنوری كوردستان وه‌ك هه‌نگاویكی سه‌ره‌تایی بۆ ئه‌و په‌یماننامه‌یه‌ی كه  بۆ ماوه‌یه‌ك له‌نیوان دو زلهیزه‌كه‌دا راگیراوه، من پیشنیاری به‌ریزتان ده‌سه‌لمینم  كه به یاوه‌ری یه‌كیك له كۆنسۆله‌كانی حكومه‌تی خاوه‌ن شكۆ بیت كه خۆی به مه‌سه‌له‌كه ناساندوه.

(ئیمزا) گرانڤیل

## ژماره:٢٥

له مسته‌ر پله‌نكیت وه بۆ ئیرل گرانڤیل– (له ٤ی تشرینی دودا وه‌رگیراوه)

(به بروسكه)                    سانت پیته‌ر سبورك، ٤ی ت ٢، ١٨٨٠.

پیم گه‌یشتوه كه حكومه‌تی روسیا دایناوه هیزی روسی بنیریت بۆ كۆمه‌كی ئیرانیه‌كان له بۆ ملدانه‌واندنی كورده تالآنكه‌ره‌كان له‌سه‌ر  سنوری روسیا– توركیاو، شای ئیرانیش ئه‌م عه‌رضه‌ی قبولّ كردوه. واباس ده‌كریّ، ئه‌و هیزانه‌ی روسیا كه له‌م كاره‌دا به‌كار ده‌هینرین به ژماره كه‌م بن، له‌وانه‌یه هه‌ندیّ له پاسه‌وانانی سنور بن.

## ژماره: ٢٦

له ئیرل گرانڤیل وه بۆ مسته‌ر پله‌نكیت

به‌ریز،               وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه، كاتژمیر ٤ی پاش نیوه‌رۆ ٦ی ت ٢، ١٨٨٠.

نیشانه به بروسكه‌تان له ٤ی ئه‌م مانگه‌دا، پیویسته ئامۆژگاری ئه‌وه‌ت بكه‌م كه پرسیار له حكومه‌تی روسیا  بكه‌یت گه‌ر تۆ به‌شیوه‌یه‌كی دروست ئه‌و عرضه‌ت پیّ راگه‌یه‌ندرابیت كه كراوه بۆ یارمه‌تیدانی ئیران له داپلۆسینی كورده راپه‌ریوه‌كاندا.

(ئیمزا) گرانڤیل

## ژماره: ٢٧

له مسته‌ر گۆشن وه بۆ ئیرل گرانڤیل   (له كاتژمیری ٧,١١ پاش نیوه‌رۆی ٧ تشرینی دوه‌مدا وه‌رگیراوه)

(به بروسكه)                    ئه‌سته‌مولّ، ٥,٤٥ پاش نیوه‌رۆ، ٧ ت ٢، ١٨٨٠.

پیم راگه‌یه‌ندراوه كه حكومه‌تی تورك كه‌وتۆته كاركردن بۆ ریگه‌گرتن له تاقمه كورده كۆچه‌ره‌كان كه نه‌چنه ناو خاكی توركیاوه. نۆ به‌تالیون نیردرابو بۆ دروستكردنی پشتینه‌یه‌ك.

## ژماره: ٢٨

**لە مستەر پلەنکیت وە بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(بە بروسکە لە ٧ تشرینی دوەمدا گەیشتوە)**

**گەورەم، سانت پیتەرسبوگ، ٨ ت٢، ١٨٨٠.**

**ئەم بەیانیە، ئەز شەرەفی ئەوەم هەبو بروسکەی ٦ی ئەم مانگەی جەنابتان وەربگرم کە لیم دەخوازن لە حکومەتی ئیمپراتۆریەت بپرسم گەر من بەشیوەیەکی راست پیم راگەیەندرابیت کە ئیمپراتۆری روسیا یارمەتی ئیران بدات بۆ دامرکاندنی راپەرینی کوردەکان.**

**لەبەر ئەوەی ئیمرۆ یەك شەممەیە، ناتوانم تا سبەینێ بارون جۆمین ببینم. رۆژنامەی "Bereg" وتاریکی بڵاوکردۆتەوە، تەرجەمەکەی هاوپیچ لەگەڵ ئەم نامەیەدایە، دەلیت شای ئیران بوە کە داوای یارمەتی لە روسیا کردوە بۆ کۆتایی هینان بە یاخیبونی کوردەکان.**

**Berey لەسەری دەرواتو دەلیت، روسیا یارمەتی ماددی (material) دەدات تەنها لە حالەتیکدا ئەگەر ئیران نەتوانیت بۆخۆی ئاژاوەکان دابمرکینیتەوە.**

**(ئیمزا) پلەنکیت**

## هاوپیچی ژ: ٢٨

**هەلبژاردە لە رۆژنامەی "Bereg" وە**

**(تەرجەمە) سانت پیتەر سبورگ، ٧ی ت ٢، ١٨٨٠.**

**ئاژاوە لە ناو ئیراندا- . رۆژنامەی "Bereg" هەندێ هەوالی وریاکردنەوەی لەم وڵاتەوە بڵاوکردۆتەوە، کە سنوری بە روسیاو، ئەفغانستانو تورکیاوەیە، ئەو وڵاتانەی کە بایەخیکی زۆر ئەدەن بە مەسەلەی رۆژهەڵات. هاوسێی ئەم وڵاتانە، ئەو بەشەی ئیرانە کە کوردەکان ئیستا هەولئەدەن جێ پییەکیان تیایدا هەبێ، بە تایبەتی لەو ناوچانەی ئەرمەنیەکاندا کە بەم دواییە بە دەستمانهینایەوەو، هەروەها لەلاکەی تریشەوە روەو ئەرمینیای تورکی کە عنصری ئەرمەنی هەمیشە لە ململانییەکی زۆردا بوە لەگەڵ کوردا.**

**لەسەر وەختی دواجەنگەوە لە رۆژهەڵاتدا، کەلینیکی فراوان لە نیشانەکانی سنوری ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بەدی دەکریت کە لەنیو مەسەلەی تردا، تەعبیرەکە لەسەرهەلدانی خیلە عەرەبەکاندا هەیە.**

**کوردەکان دژی ئیران راپەریون. تۆ بلێی تورکیا دیسان دەستی لەم گەمەیەدا نەبێ؟ ئایا لەوانە نیە بابی عالی بەهیوا بیت بارودۆخیکی خراپی تازە بینیتە کایەوە**

که وەك بەهانەیەك بەکاری بهینیت بۆ ئەوەی مل نەدا بۆ بڕیارەکەی کۆنفرانسی بەرلین، ئەوەندەی کە پەیوەندی بە ئەرمینیاوە هەیە؟ ڕەنگە دیپلۆماتەکان لە ئەستەموڵ نیازیان وابیت کە بە هەمان شیوە سود لە کوردەکان وەربگرن، هەر وەك لە ئەلبانیەکانیان وەرگرت لە مەسەلەی مۆنتنگرایندا. لەوانەیە ئەم پرسیارانە هەموی بەم زوانە وەڵام بدرینەوە.

لە ئیراندا، چەندین مەسەلەی سیاسی گران بەیەکەوە گریدراون، بەهەمان شیوە مەسەلەی ئابوری کەلای روسیاو ئینگلستان بە بایەخن.

لە سالی ١٨٤٤وە تا ١٨٥٣، لەنیوان کابینەکانی لەندەنو پیتەرسبورگدا، تیگەیشتنیکی تەواو هەبو سەبارەت بە وەزعی ئیران. ئەم تیگەیشتنە کە باشترین ئەنجامی هەبو، بە جەنگی قەرم تیکدرا. ئینجا، خستنەروی ئەم مەسەلەیە دەبێ زۆر خوازراو بێ، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی مەسەلەکە بە بەردەوامی زۆر شوین سەرنجی روسیایەو لە راستیشدا هیچ هۆیەك نیە کە پیویست بە دوژمنایەتی بکات لە نیوان روسیاو ئینگلستاندا لە ئاسیای ناوەراستدا.

ئەو لەیەك گەیشتنە چاکەی کە لەنیوان روسیاو ئیراندا هەیە، بەم دواییانە هەروەك لەلایەن هەندێ ناوەندی ئاگادارەوە باسکراوە، پشتگیری لەو راستیە دەکات کە ئیران داوای کۆمەکی سەربازی روسیای کردوە دژی کوردەکان، بەو باوەرەی کە سەرهەلدانە ناوچەیەکی زۆر گەورەتر دەگریتەوەو بۆ سنوری روسیاش بلاودەبیتەوە. ریگە بەهیزەکانی روسیا دەدریت کە لە خاکی ئیراندا مانۆر بکات بۆ ئەوەی شۆرشەکەی ئەم تالانکەرانە دامرکینێو، هەروەها بۆ گریمانی ئەوەی کە کوردەکان هەولئەدەن پەنا بەرنە سنوری تورکیا، لەوەختیکدا هیزەکانی روسیا فرمانیان دراوەتێ کە بەهیچ جۆریك بۆی نەچن.

رەنگە یارمەتی روسیا پیویست نەبیت، چونکە دوا راپۆرتەکانی روسیا لەسەرخۆ ترن.

## ژمارە: ٢٩

لە مستەر پلەنکیت وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٨ی تشرینی دوەمدا وەرگیراوە)

گەورەم، سانت پیتەر سبورگ، ٣ی ت٢، ١٨٨٠.

بەم دواییانە، بارون جۆمین دەربارەی ئەو ئالۆزیە مەترسیدارانە قسەی بۆکردم کە بەهۆی ئەو ئاژاوەیەی کوردەکانەوە سەرهەلئەدا کە ئیستا دەیخولقینن لەسەر سنوری تورکیا– ئیرانو، مەترسی ئەوەش هەبو کە ئەو شتەی دوای ئەوە ببینین کۆمەلەیەکی کوردی بیت، کە سولتان لەوانەیە بەباشی بۆ مەبەستیك بەکاری بهینیت، وەك کۆمەلەی ئەلبانیەکانی بەکارهینا.

بەریزی لەسەری رۆیشتو گوتی، لەوانەیە ئەم ئاژاوانە بڵاوببنەوە بۆ ناوچەكانی نزیكتر بە سنوری روسیاو، لەو حالەتەشدا حكومەتی ئیمپراتۆریەت راستەوخۆ زۆرتر بایەخ بە مەسەلەكە ئەدا وەك لەوەی ئیستا بە خۆشیەوە داویتی.

(ئیمزا) ف. ر. پلەنكیت

## ژمارە:٣٠

### لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل (لە كاتژمیری ٨,٣ پاش نیوەرۆی ٨ تشرینی دوەمدا گەیشتوە)

بە (بروسكە) تاران، ٨ی ت٢، ١٨٨٠.

ئیرانیەكان هیشتا ورمیٚیان بەدەستەوەیەو لە نزیكیشەوە شەر بەردەوامە، بەڵام وەك بەرەسمی بڵاوكراوەتەوە، كوردەكان نەكشاونەتەوە. ئیرانیەكان لە بینەب سەركەوتنیكیان بەدەست هیناوە، كوردەكان نزیكەی ٣٠٠ كەسیان لە دەستداوە.

## ژمارە: ٣١

### لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل

### (بە بروسكە لە ٨ی تشرینی دوەمدا گەیشتوە)

گەورەم، تاران، ٨ ت٢، ١٨٨٠.

نیشانە بە بروسكەی پیشوم بە بەرواری ئیمرۆ دەربارەی یاخیبونی كوردەكان لە ئازەربایجان، ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بە جەنابتان رابگەیەنم كە ئیستا هیوای حكومەتی ئیران بوژاوەتەوە بەوەی كە بتوانیت لەریگەی گفتوگۆوە یەكبونی كوردەكان بترازینیتو لەت لەت بكات. ئەم هیوایەش لە نیشانەی ئەو ناریكیانەوە دیت كە ئیستا لەناو كوردەكاندا بەدەركەوتوە. وا باسدەكریت كە هەندێ لەو كوردانە شیخیان جیهیشتبیتو حەز بكەن بگەرینەوە بۆ وەلاكەی خۆیان بۆ شا.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ٣٢

### لە مستەر پلانكیت وە بۆ ئیرل گرانڤیل

### (بە بروسكە لە ٨ تشرینی دوەمدا وەرگیراوە)

گەورەم، سانت پیتەر سبورگ، ٨ ت ٢، ١٨٨٠.

بەدوی بروسکەی ٦ی ئەم مانگەی جەنابتاندا، ئیمرۆ سەردانی وەزارەتی دەرەوەم کرد بۆ ئەوەی لەریگەی بارۆن جۆمین وە بزانم ئاخۆ راستە کە ئیمپراتۆری خاوەن شکۆ بەلینی داوە هیزەکانی روس بنیریت بۆ یارمەتیدانی شای ئیران بۆ مل پیدەواندنی کوردە تالانچیەکان.

لەو کاتەدا، بارۆن جۆمین بە ئەنجومەنیکی وەزارەتی کاروباری دەرەوە خەریك بو، بەلام زۆرباش بو و هاتو قسەی بۆ کردم.

پیی راگەیاندم، کە ئەوە شا بوە خواستی خۆی بۆ وەزیری مفوض لەتاران دەربریوە کە یارمەتی خاوەن شکۆ بدات بۆ گیرانەوەی نیزام لەناو خیلە کوردەکاندا.

بە بیستنی ئەم داوایە، ئیمپراتۆر دەستبەجێ رازی بو، بەلام بە پونگانەوەیەکی ئاشکراوە کە هیزەکانی روس بەهیچ جۆریك ریگە نادرین دوای کوردەکان بکەون بۆ ناو خاکی تورکیا.

بارون جۆمین گوتی، ئەو دوا هەوالانەی لە کوردستانەوە گەیشتون، زۆر باشتر بونو، لەوانەیە ئیتر یارمەتی روسیا پیویست نەبیت. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ ئیجرائات کرابو بۆ هینانی هیزی پیویست بۆ سنور، نەبادا لەوەدوا پیویست بن.

بەریزی نەیتوانی ژمارەی ئەم هیزانەم پیرابگەیەنیت کە پییان وترابو بچن بۆ ئەو کارە.

(ئیمزا) ف. ر. پلەنکیت

## ژمارە: ٣٣

لە مستەر گۆشن وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٩ی تشرینی دوەم وەرگیراوە)

گەورەم، ثیراپیا، ١ی ت٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە گەیشتنی نامەی مانگی رابوردوی جەنابتان پێ رابگەیەنم، ئەوەی کە جەنابتان بۆ جاریکی تریش نیشانە ئەدەن بەسودی پەیماننامە پیشنیارکراوەکەی نیوان تورکیاو ئیران، سەبارەت بە پەلاماردانی کوردەکان لەناو سنورەکانیاندا، بۆ ئەوەی ئەوەندەی دەتوانرێ وتوویژکردن لەسەری دوانەکەویت. من هەل نیە نەمقۆستبیتەوە بۆ قسەکردن لەگەڵ وەزیرەکاندا لەسەر مەسەلەی ئاشوبەی ناو کوردەکان. جار لەدوای جار دلنیام کردونەتەوە کە قەناعەتم هەبوە بەوەی کە کوردەکان ئەوانیان بەهیچ نەزانیوە. هەولم داوە، ئەوە بۆ قەدری پاشاو عابدین پاشا بسەلمینم کە تازوە وتوویژەکانی نیوان تورکیاو ئیران تەواو بکریتو، هەروەها پیم داگرت لەسەر باسکردنی مەسەلەی کورد لەگەڵ عاسم پاشادا، ئەگەرچی ئەو بایەخیکی کەمی پێئەدا. ئیستاش، نامەیەکی رەسمی ئاراستەی بابی عالی

دەکەم کە پیویستە وەڵامیکی  نوسراوی بۆ بدریتەوە. من هیچ هۆیەك شك نابەم کە لەو باوەرەدابم بابی عالی نارەزایی  لەسەر ئەو ریکەوتنە پیشنیازکراوە هەبیت، بەڵام وەزیرەکان بایەخیکی جددیان پینەداوە. من هەمیشە بەگازندە وەڵامم دراوەتەوە، بەوەی گوایە خیلە کوردەکانی دانیشتوی ئیران سەرپیچیکەری سەرەکی بونە، بەڵام ئەمە هیچ بەلگەیەك نیە دژ بە پەیماننامەکە، کە زۆر پیویستە.

(ئیمزا) جۆرج جەی. گۆشن

## ژمارە: ٣٤

### لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل

(لە ٩ی تشرینی دوەمدا بە بروسکە گەیشوە)

گەورەم،                    تاران، ٩ی ت٢، ١٨٨٠.

نیشانە بەنامەی پیشوتر سەبارەت بەیاخیبونی کوردەکان، ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بە جەنابتان رابگەیەنم کە ئیقبال الدولەی  حاکمی ورمێ راپۆرتی بە حکومەتی ئیران لیرە داوە، کە توانیویتی کوردەکانی ژیر فەرماندەیی شیخ عوبەیدوالله لە سەنگەرەکانیان لە سیر وەدەربنێو، ئیستاش کشاونەتەوە بۆ گوندی اسماعیل کەلاسی، کە نزیکەی ١٠ میل لە ورمێوە دورە، روەو مەرگەوەر بەلای سنوری تورکیادا.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ٣٥

### لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ مستەر پلەنکیت

بەریز،                    وەزارەتی دەرەوە، ٩ی ت٢، ١٨٨٠.

ئیمرۆ سەفیری روسیا سەردانی کردمو، نیشانەیدا بە  چونی باندە کوردەکانەوە بۆ ناو خاکی ئیران.

شازادە لۆبا نوڤ گوتی، شا داوای یارمەتی لە ئیمپراتۆر کردوە دژی ئەم خیڵانەو، هانی خاوەن شکۆی داوە هیز بنیریتو بیخاتە ژیر تصرفی حکومەتی ئیرانەوە. بەڵام ئیمپراتۆر ئەوەی رەفز کردوە،  ئەگەرچی رازی بوە بەوەی ریگە بدات هەندێ لەهیزەکان  لەسەر سنور کۆببنەوە. ئەم بابەتەی سەرەوە، بە بروسکە بۆتان رەوانەکراوە.

(ئیمزا) گرانڤیل

## ژ:٣٦

### له مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل
### (له ١٢ی تشرینی دوەمدا به بروسکه گەیشتوه)

گەورەم، تاران، ١٢ی ت٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیه به جەنابتان رابگەیەنم که دوینێ لەریگەی میرزا سەعید خان وە پەیامیکم لە شاوە پیگەیشت، داوام لیدەکات پیزانینی تەواوی خاوەن شکۆت پیبگەیەنم سەبارەت بەو رۆلە چاکەی جەنابتان دیوتانە لەهاندانی سولتاندا بۆ هاوکاریکردن لەگەلیدا بۆ دامرکاندنی یاخیبونی کوردەکان. خاوەن شکۆ گوتی، ئیران هەمو هەولیکی داوە بۆ نەهیشتنی ئاژاوە، بەلأم هیشتا مەترسی ئەوەی هەبو که سەرکردەکانی شۆرشەکە، بۆ ناو خاکی روسیا هەلأتبیتن.

خاوەن شکۆ بەجدیەوە داوای ئەوەی دەکرد که جەنابتان چالاکانە هانی حکومەتی عوسمانی بدەن بۆ پیویستی جیبەجیکردنی ئەو بەلینی هاوکاریکردنەی که پیشتر داویانەو، بۆ دەستگیرکردنی شەخسی شیخ عوبەیدوالله، کورەکانی، یان هەر دنەدەریکی سەرهەلدانەکە، که لەسنوری تورکیا دەپەرنەوە، وە لە حالەتی گرتنیشیاندا، دەبیت سزایەکی وابدرین که ببنە عیبرەت، بەشیوەیەك که لە ئیستا بەدواوە به تەواوی ریگەگر بیت له کوردەکان کەئاژاوەی لەو جۆرە له سنوری ئیرانی ئارامدا بنینەوە.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ٣٧

### له مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل- (له ٦ی کانونی دوەمدا به بروسکه گەیشتوه)

گەورەم، تاران، ١٢ ت٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیه به جەنابتان رابگەیەنم که هەوالی مردنی حشمەت الدوله، حەمزە میرزا که بەو دواییانه بۆ فەرماندەیی هیزەکان لیرەوە نیردرابوە سنور بۆ دامرکاندنی سەرهەلدانی کوردەکان، گەیشتە تاران.

دوینێ بروسکەیەکی حکومەتی ئیران له سوپا سالار، حسین خان وە گەیشت، بەهاناچونی سابلاخ به خاوەن شکۆ رادەیەگەنیت، که هیزەکانی ژیر فەرماندەی ئیعتماد الدوله به ئەنجامیان گەیاندوە. هەروەها پایەبلندی راپۆرتی ئەوەی داوە که کورەکەی شیخ عوبەیدوالله، پیکەوە لەگەلّ هەمزاغای سەرەك هۆزی کوردی ئیرانی، لەو ناوچەیە هەلأتونو هیزیکیش نیردراوە بۆ راونانیان.

هەروەها، یەکیك لەخیلە یاخیبوەکان هەولی داوە بەرەو سنور بکشیت بۆ ناو خاکی تورکیا، بەڵام هیزەکانی ئیرانی گرتیانو گیرایاننەوە، زیانی کوردەکانیش ۲۰۰ کەس کوژراوە.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ۳۸

لە مستەر گۆشن وە بۆ ئیرل گرانڤیل (لە ۱۳ تشرینی دوەمدا وەرگیراوە)

(بە بروسکە) ثیراپیا، ۱۳ی ت۲، ۱۸۸۰.

ئایا بۆم هەیە داوا لە بابی عالی بکەم کە شیخ عوبەیدوللەو کورەکانی بگریتو سزاشیان بدات بەشیوەیەك کە ببنە عیبرەت؟

من دلنیام لەوەی کە کاریکی واناکەن بە توندی مامەلە لەگەڵ شیخ عوبەیدوللەدا بکەن، چونکە لەوانەیە هەنگاوی لەوجۆرە ببیتە هۆی راپەرینی کوردەکانی تورکیا.

## ژمارە: ۳۹

لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ مستەر گۆشن

بەریز، وەزارەتی دەرەوە، ۱۳ی ت۲، ۱۸۸۰.

نیشانە بە بروسکەی ئیمرۆتان، ئەو گازندانەی کە پیویستە سەبارەت بە شیخ عوبەیدوالله بۆبابی عالی بکەن، بۆخۆتان جیٚ دەهیلم.

راپۆرتی کۆنسوڵەکان ئەوە دەردەخەن کە لە راستیدا شیخ نابیتە مەترسی بۆ تورکەکان گەر هیزی نیزامی دژی بنیردریت.

پیویستە ئاگاداری بابی عالی بکەیت کە پەنا یان پشتگیری شیخ نەکات، کە لەوانەیە ببیتە هۆی دوژمنایەتی لەنیوان ئیرانو تورکیادا.

(ئیمزا) گرانڤیل

## ژمارە: ٤٠

لە مستەر گۆشن وە بۆ ئیرل گرانڤیل (لە ١٦ی تشرینی دووەمدا وەرگیراوە)

گەورەم، ئەستەموڵ، ۹ی ت ۲، ۱۸۸۰.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپیچ دو نامە لە جیگری کۆنسوڵ،کلایتون وە بۆ مەیجەر ترۆتەر– تان بۆ بنیرم کە دەربارەی مەسەلەی کوردە.

من به بایەخیکی زۆرەوە موتابەعەی بزوتنەوەی کورد دەکەم، بەڵام لە تواناادا نیە زانیاری زۆری شوین باوەرم چنگ بکەوێ.

بەهەر حاڵ، باوەرم وایە کە لەوانەیە لە چەند رۆژیکی کەمدا هەندێ مەسەلەی گرنگ کە پەیوەندی بەمەوە هەیە، بۆ جەنابتان بنیرم.

(ئیمزا) جۆرج جەی. گۆشن

## هاوپیچی ١ی ژمارە: ٤٠

### لە کاپتن کلایتن وە بۆ مەیجەر ترۆتەر

بەریز، وان، ٥ی تشرینی یەکەم، ١٨٨٠.

سامیح پاشا پیی راگەیاندوم کە کیشەو گیرو گرفتیکی زۆر پەیدا بوە لەنیوان میللەتی شیخ عوبەیدوڵلاو کاربەدەستانی ئیراندا. بەپیی قسەی سامیح پاشا، پانزە یان شانزە سالیك لەمەوبەر، هەمزاغا ناویکی خەلکی کەرکوکی ئەو نزیکانە گیرابو و نیردرابو بۆ ئەستەموڵ. پاش ئەوەی بۆ نزیکەی ١٥ ساڵ لە زیندان دەمینیتەوە، بە بەلینی ئەوەی رەفتاری باش بیت، بەر دەدرێ، بەڵام لەبری ئەوەی بەبێ دەنگ لەنزیك کەرکوك بمینیتەوە، دەپەریتەوە ئەو دیو سنور بۆ ئیران‌و دەکرێ بەسەرەك خیلی مەنتوری کوردان. نزیکەی دو مانگ لەمەوبەر، کاربەدەستە ئیرانیەکانی سابلاخ بە بیانوی قەرز نەدانەوە، وەیان لەبەر هەندێ هۆی تر خزمیکی دەگرن. هەمزاغا دەچیت بۆ سابلاخ‌و داوا دەکات گەر کەمیك لەسەری بوەستن، پارەکە بداتەوە. بەڵام حاکمە ئیرانیەکە فەرمانی گرتنی هەمزاغا ئەدات‌و ئەویش خەنجەرەکەی هەلدەکیشیت‌و دەست دەکاتە پەلاماردانی ئەو کەسانەی لەوێ ئامادەبون. چەند کەسیکیان لیدەکوژیت‌و بریندار دەکات، ئینجا خۆی هەلئەداتە سەر ئەسپەکەی‌و دەرباز دەبیت. راپۆرتیك لەسەر روداوەکە بۆ تەوریز نیردرابو و بەخیراییش فەرمان بە هیزەکان درابو کەبچن سزای مەنتوریەکان بدەن‌و هەمزاغاش بگرن. پاشان هەمزاغا پەنا بۆ شیخ عوبەیدوڵلا دەبات‌و سەمیح پاشاش ئیمرۆ پیی راگەیاندم کە زانیاری تازەی پیگەیشتوە بەوەی کە عەبدولقادری کوری شیخ عوبەیدوڵلا لەگەڵ ٥٠٠٠ بۆ ٦٠٠٠ کەسدا داویەتیە پاڵ مەنتوریەکان‌و ئیستا بەرەو ساڵاخ دەکشێ؛ بەڵام هیزەکانی ئیران نزیکن‌و پیکادانیش چاوەروان دەکرێ.

سامیح پاشا، هەروەها پیی راگەیاندم کە شیخ عوبەیدوڵلا سویندی بە قورئان خواردوە کە دلسۆز بیت بۆ سولتان. بەهەرحاڵ، واتە واتی تریش هەنە کە شیخ دەستی کردوە بە جوڵانەوە دژی دەسەڵاتی تورك.

بۆچونی من ئەوەیە، کە گرنگی جوڵانەوەکەی ئیستا دژی کاربەدەستە ئیرانیەکان هەرچیەك بیت، شیخ لەو نیوانەدا هەندێ بەرنامەی هەیە. سەرەرای ئەوانەش کە من تیی گەیشتوم لەماوەی سەردانەکەمدا بۆ هەکاری، هەروەك لە نامەی ١١ی تەمموزی

۱۸۸۰شدا باسم کردبو، بیستومه که شیخ کۆنفرانسی تازەی لەگەڵ سەرەك کوردەکاندا کردوە، بەڵام سەبارەت بە ئامانجەکەیان، من ناتوانم بلیم ئەگەر دژی دەسەڵاتی تورك بیت، وە یان بەهۆی ئەو واتەواتانەی دامەزراندنی دەولەتیکی ئەرمەنیە کە ئەوەندە زۆر دانیشتوانە موسولمانەکانی ئەم ناوچانەی هەژاندوە.

(ئیمزا) ئیمیلیەس کلایتن

## لە کاپتن کلایتن وە بۆ مەیجەر تورتەر

بەریز، وان، ٥ی تشرینی یەکەم، ۱۸۸۰.

کاتیك کە پایز دەچیتە پیشەوە، راو و روتو تالأنی کوردەکان زیاد دەکات. بەدەگمەن رۆژیك تیدەپەرێ بەبێ ئەوەی هەندێ روداوی تازە باس نەکریت. لە ۲۹ی ئەیلول‌دا، قەشەی گوندی ئەرمەنی، لە نوردوز لەگەڵ پیاویکی تردا هاتن بۆ لام‌و وتیان رۆژیك یا دو رۆژ لەوەبەر، ۱۲۰ لە کوردەکانی مامخۆران پەلاماری گوندەکەیان داون‌و، هەولیان داوە رانە مەرەکانیان ببەن. بەڵام گوندنشینەکان بەرگریان کردوە؛ پینج کەس کوژراون‌و چەند کەسیکیش لە هەردولا بریندار بون‌و، کوردەکانیش ناچار بون پاشەکشێ بکەن. بەهەرحاڵ، گوندنشینەکان مەترسی ئەوەیان هەبوە کە کوردەکان بە ژمارەی زۆرتر بگەرینەوەو تۆلە بستینن‌و، داوایان لە من کرد هەولبدەم کاربەدەستەکان هەندێ هیز بنیرن بۆ پاریزگاریکردنیان.

بەم پییە، رۆژی دوایی کاربەدەستەکانم بینی‌و، سەمیح پاشاش بەلینی‌دا کە هەندێ سوارە بنیرێ. بەهەرحاڵ، تا ئەم ساتەش هیچ کەسیك نەرۆیشتوە، بەڵام ئەم ئیوارەیە لە مواڤینەوە پەیامیکم پیگەیشتوە دەلیت ئیمشەو کۆمەلیك دەکەونە رێ. بەهەر حاڵ، تورکەکان ئەم ئازایەتیە نائاساییەی ئەرمەنیەکان کە لەشەردا پیشانی ئەدەن، بەهیچ جۆریك پەسەند ناکەن.

پیرێ، بۆ جاریکی تریش، لەسەر ریگەی خوتود کە پینج سەعات لەوان وە دورە، کاروانیك پەلامار دراوە. سی باریك بردراوەو چەند کەسیکیش بریندار بونە. هەروەها راپۆرتی روتکردنەوەشم پیگەیشتوە کە لە ئارجەش‌و ئەلجیفاس رویداوەو ئیستا والی لییە. وا باس دەکرێ کە گوێ لە هیچ گازندەیەك ناگرێ‌و دەلیت ئەو نەهاتوە بۆ سزادانی کوردەکان بەلکو بۆ ریکخستنی ئیدارەکان هاتوە. هەروەها وا باسدەکریت کە چەکی بەسەر کوردەکانی نزیك ئارجەشدا دابەشکردوە تا بتوانن بەرەنگاری پەلاماری خیلەکانی سنوری ئیران ببنەوەو، کاتیکیش کە ئاگادار کراوە کە رەنگە کوردەکان ئەم چەکانە دژی مەسیحیەکان بەکاربهینن بۆ تالأنکردنیان، وتویەتی هیچ

مەترسیەك نیە. چاوەدیری بەویژدان (نزیە) دەزانیت کە مەترسی هەیە، کاتێ دەبینی لەهەمو لایەك چی روئەدات.

راپۆرتەکانی هەکاری ئەوە نیشان ئەدەن کە لەوێ پشیویەکی تەواو هەیە. کوردەکان، بەتایبەتی شیخەکان هەمو ولاتەکە بەریوە دەبەن‌و، پیدەچێ حکومەت بێ دەسەلات بێ. یەکێ لەبەرپرسە تورکەکان، سەرۆکی دادگای مەدەنی، پیرێ پیی گوتم "من نازانم گەر تۆ نیازت هەبێ لەم کاتەدا گەشتێ بۆ هیچ لایەك بکەیت، بەلام ئامۆژگاریت دەکەم کە نەچیت بۆ هەکاری؛ بارودۆخەکەی ئەوێ تەواو نیە. پیشتر، زۆر سەرگورشتەی ناراست دەربارەی روتکردنەوە دەگیردرایەوە، بەلام ئیستا راستە." هۆی چالاکی کوردەکان لەم کاتەدا ئەوەیە کە ئەوەندە نیە کاتی دروینە تەواو بوەو زەخیرە بۆ زستان کۆدەکەنەوە.

ئەوەی نائارامیەکەی ئیرەی زیاد کردوە، دوینێ زەپتیەکانی ئیرە (Zaptieh) مانیان گرتبو. فرمانیان پیدرابو کە بچن بۆ چەند شوینیك بۆ گرتنی خەلك‌و راگرتنی نیزام، ئەوانیش رەفزیان کردبو برۆن‌و گوتوبویان وا بۆ چل یان پەنجا مانگ دەچیت نە موچە نە ئازوقەیان وەرنەگرتوە. لە راستیدا هەموو حکومەتەکە پەکی کەوتوە بەهۆی نەبونی پارەوە. ئیمرۆ سامیح پاشام بینی‌و هانمدا کە هەندێ ئیجرائات بکات بۆ راگرتنی راووروتی کوردەکان. وەلامی دامەوە: " ئەوەی بتوانم دەیکەم، بەلام دەتوانم چیبکەم؟ هیچ پارەمان نیە، خۆت دەزانیت زەبیتەکان رەفزیان کردوە کاربکەن‌و، منیش پارەم لانیە کە هیزە نیزامیەکان بەریوە ببەم". لە ئەنجامی برسیتیەکەدا، داهات کەم بۆتەوەو ئەوەیش کە دیت لەلایەن فەرمانبەرە برسی‌و بەرتیل خۆرەکان‌و داوا پر لە فەرمانەکانی ئەستەمولەوە بۆ پارە قوت دەدرێ، بەجۆریك هیچ نامینیتەوە بۆ موچەی فەرمانبەرە سانەویەکان، هیزەکان وەیان زەبیتەکان‌و، تیگرای حکومەت‌و بەریوەبەرایەتیەکەش بۆ خۆی چەقیوە. هەمو بارودۆخەکە پرە لەنیگەرانی.

(ئیمزا) ئیمیلیەس کلایتن

## ژمارە:٤١

**لە ئیرل گرانڤیل بۆ مستەر پلەنکیت**

**بەریز، وەزارەتی دەرەوە، ١٦ ت ٢، ١٨٨٠.**

**لەنامەیەکی M.de Giers وە بۆ سەفیری روسیا، نیشانە دراوە بە داواکەی شا بۆ یارمەتی روسیا بۆ دامرکاندنی راپەرینی کوردەکان، ئەویش وەك یەکە لەگەڵ ئەو زانیاریەی پیشتر دەربارەی ئەم مەسەلەیە بۆت ناردبوم.**

**میر لۆبانۆڤ ئامۆژگاریکراوە کە من دلنیا بکات لەوەی کە ئیمپراتۆر سورە لەسەر ئەوەی کە کاتێ فەرمانی بەهیزەکانی داوە، لە سنور نزیك نەبنەوەو ئەوەندەی ئەتوانن نەپەرنەوە، چونکە خاوەن شکۆ بەشیوەیەکی راستەوخۆ لەجیاتی ئیرانیەکان دەست تیوەردان ناکات بۆ ئەوەی حەساسیەتی نیو دەولەتی نەوروژینیت.**

**میر لۆبانۆڤ گوتی؛ وەك ئەو تیگەیشتوە، خواستی روسیا خۆی بوە کە لەنیو سنوری خۆیدا بمینیتەوەو نەچیتە پیشەوە، نەبۆ ناو خاکی تورکیاو نەبۆ ئیرانیش.**

**من وەڵامم داوەتەوە کە بیگومان ئەوە گرنگترین کۆتاییە کە تیبینی بکریت.**

**(ئیمزا) گرانڤیل**

## ژمارە: ٤٢

**لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(بە بروسکە لە ١٩ تشرینی دوەمدا وەرگیراوە)**

**گەورەم، تاران، ١٩ی ت ٢، ١٨٨٠.**

**ئیمرۆ بروسکەیەکم هەر بە بەرواری ئیمرۆ لە کۆنسۆلی گشتی حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا لە تەوریزەوە وەرگرت، تیایدا رایدەگەیەنیت کە تیگرای هیزەکانی شیخ عوبەیدواللە هەڵاتونو لەورمی کشاونەتەوە بۆلای مەرگەوەرەوەو، تەیمور پاشا خانیش لەگەڵ ئیقبال الدولەی حاکمی ورمیو هیزەکانی ئیران کە لەژیر فەرماندەیان، راویان دەنین.**

**(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن**

## ژماره: ٤٣

**له مستەر تۆمسن وه بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(به بروسکه له ٢٠ تشرینی دوەمدا وەرگیراوه)**

**گەورەم،                تاران، ٢٠ ت ٢، ١٨٨٠.**

**ئەوەنده نابیت زانیاریم له کۆنسۆلی گشتی حکومەتی خاوەن شکۆ له تەوریز که بەرواری دوینێی لەسەرە، وەرگرتوەو گەیشتنی ژمارەیەکی زۆر له کۆزاکەکان که چەند فەوجیك دەبن، بۆ نەخچەوانی سەرسنوری روسیا، دەگەیەنیت.**

**ئەمانه دەبو بەخیرایی له جەلفا، که خالیکی سنوریه لەسەر ریگا سەرەکیەکەی تەوریز، دەست بەکاربن‌و، هەروەها جموجولی لەبەرچاوی هیزەکانی روسیاش لەنیوان ئەم شوینەو نەخچەواندا هەبو.**

**مستەر ئابۆتیش هەروەها پیی راگەیاندم که بیستویەتی هیزیکی گەورەی روس چاوەروان دەکریت بگاته جەلفا.**

**(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن**

## ژماره: ٤٤

**له مستەر پلەنکیت وه بۆ ئیرل گرانڤیل– (له ٢٢ی تشرینی دوەمدا وەرگیراوه)**

**گەورەم،                سانت پیتەرسبورگ، ١٧ی ت٢، ١٨٨٠.**

**ئەم دوای نیوەرۆیه پرسم لەبارۆن جۆمین کرد دەربارەی ئەوەی گەر هیچ هەوالیکی تازەی کوردستانی لاهەبیت.**

**وەلامی دایەوه که پیدەچێ تازەترین هەوالەکان زۆرتر شوین رەزامەندی بن. له قۆناغی یەکەمدا حکومەتی ئیران لەوه ترسابون که لەوانەیه کوردەکان یارمەتی زۆریان له تورکیا وەرگرتبیت.**

**بەلام ئیستا ئیرانیەکان لەم بەشەدا هەستیان به دلنیایی زیاتر کردوەو وردە وردە یاساو نیزامیان گیراوەتەوه.**

**هەولمدا شتیکی زیاتر دەربارەی جۆری یارمەتیه سەربازییەکەی روسیا بخەمه پیش چاو که بەلینی به ئیران دابو، بەلام هیچ شتیکی زیاترم چنگ نەکەوت لەو بۆچونه زیاتر که یارمەتیەکانی روسیا چیتر پیویست نەبو.**

**(ئیمزا) ف. ر. پلەنکیت**

## ژماره: ٤٥

**لە مستەر گۆشن وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٢٣ی تشرینی دووەمدا وەرگیراوە)**
**(هەلبژاردە) ئەستەمولّ، ١٦ی ت ٢، ١٨٨٠.**

**لەو کاتەوەی لەنامەکەی ٢٩ی تشرینی یەکەمدا، دەربارەی مەسەلەی کورد بۆ جەنابتانم نوسیبو، بواری قسەکردنم لەگەلّ سەرەك وەزیرانو وەزیری دەرەوەدا لەسەر مەسەلەکە هەبوە، بەلاّم من هیشتا ناتوانم باسیکی ئاشکراو گریدراوی تەواو دەربارەی هۆکانی بزوتنەوەی ئیلە کوردەکانو پەلاماردانی خاکی ئیران وە دەست بهینم.**

**راپۆرتەکەی وەزارەتی دەرەوە، بەزۆری ئاماژە بۆ ئەو پیشوازیلیکردنەی سەرۆکیکی کوردی گومانلیکراو لەخاکی ئیراندا دەکات، کە لە ئەستەمولّ زیندان کرابو و، دوای ئەوەی ماوەی سزادانەکەی تەواو ببو، گەرابۆوە بۆ ولاّتەکەی خۆی؛ بەلاّم پاشان رۆیشتبو بۆ ئیرانو "بەدەست لەسەر سنگەوە پیشوازی لیکرابو".**

**خالی سەرەکی گرنگ ئەوەیە کە لی بپیچریتەوە ئایا کاربەدەستە تورکەکان بە چ چاویك دەروانننە بزوتنەوەکە. خەلکی نایانەویت بزانن کیّ ئەوە بلاّودەکاتەوە، کە روداوەکە رەزامەندیەکی زۆر نهینی لای تورکەکان پەیدا دەکاتو، بیگومان واتەواتیش بلاّوە کە تورکەکان چەکیان بە کوردەکان داوە. من دەلیم "بیگومان بلاّوە" چونکە باوەر لە نیو تەلەکە نهینیەکانی تاقمەکەی کۆشکدا ئەوەندە باو قولّ چەسپیوە، کە هیچ روداویکی لەو چەشنە بەبیّ ئەوەی هۆکانی لیك نەدرابیتنەوە رو نادات، جا راست بیّ یان هەلە، ئەمەش لە چالاکی ئەو کۆمەلە پیاوانەدایە کە سیاسەتەکەیان وەك دەلین، فراوانکردنی نفوزی تورکیایە بە هەمو لایەکی تازەدا، بەوەی کە بەشداری دەکەن لە بژاردنی ئەو خاکانەدا کە لە جەنگەکەی دواییدا لەدەستیان دابو.**

**زمانی تورکەکان سەبارەت بەم هوروژمە بۆ ناو خاکی ئیران، بەشیوەیەکی گشتی نامۆیە. ئەوان لەو باوەرەدا نەبون کە هیزەکانی ئیران بتوانن بەرامبەر کوردەکان بوەستن. گەر هیزەکانی تورك دەستیان تیوەرنەدایە، ئیرانیەکان زۆر خراپ دەگوشران. ویرای ئەوەش، وەزیری کاروباری دەرەوە خۆی دوینیّ شەو بە تەئکیدەوە بەمنی راگەیاند کە هیزەکانی تورك نەیانتوانیوە دوای کوردەکان بکەون بۆ ناو خاکی ئیران.**

**جەختم لیکرد کە ئایا تورکیا چی دەکرد. دلنیای کردم کە ئەوان ئەو کاتە ١٠,٠٠٠ هیزیان لەسەر سنور هەبو و، دەچون زۆنیکیان (نطاق) پیك دەهینا. بەدوای بروسکەی جەنابتان لە ١٣ی ئەم مانگەدا، ئەم پرسیارەم ئاراستەکرد، کە ئایا ئیمە**

پشت ئەستور بین بەوەی کە شیخ عوبەیدواللە سزا ئەدەن گەر توانیان دەستگیری بکەن، بەلاّم بەریزی وەلاّمیکی ئاشکرای ئەوتۆی نەدایەوە. ناچار بوم بۆی رون بکەمەوە کە تاوانیکی گەورە بوە کە رەعیەتەکانی زلهیزیك پەلاماری خاکی یەکیکی تر بدەن، بەلاّم انطباعیکی ئەوتۆم نەکەوتەوە دەست کە کرداری ئەو کوردانە بە تایبەتی بەتاوان دانرابیت.

من هەولم داوە کە بۆچونی خەلکی تریش لیکبدەمەوە بۆ گریمانی ئەوەی کە عوبەیدواللە سزا بدریتو، گەیشتومەتە ئەوەی کە باوەر ناکریت هیچ گریمانیك هەبیت. پیاویکی پایەبەرزی ئیرە، لیهاتوو بە توانا بە قەدەر قازیەك، بۆی رونکردمەوە کە هیچ گومانیك نیە لەوەی کە زۆرترین نەرمی پیشان ئەدریت. لەوە نەدەچو سزای عوبەیدواللە بدەن؛ کاتیك کە کاربەدەستە تورکەکان دەترسان تەنانەت سەرەك کوردیکی بچوکیش بگرنەوە کە ٣٠ کەسی کوشتبو و، لە بەندیخانەی سیڤاس رایکردبو و، ئینجا گەرابۆوە بۆ ناو خەلکەکەی‌و بەخۆشیەوە پیشوازیان لیکردبو و پاشانیش حصانەی درابویە ئەگەرچی بونیشی لە گوندەکەی خۆیدا بەتەواوی زانرابو. من هەر بەردەوام دەبم لەسەر ئاگاداریەکەم کە چ ریگەیەك ببیت بۆ پیکدادانی تورکیاو ئیران بەیەکتردا.

هەروەها، هاوپیچ لەگەلّ ئەمەدا، وتاریکی رۆژنامەیەکی خۆجیییت بۆ دەنیرم، داوای رونکردنەوەیەك دەکات بۆ ئەسلی (سەرچاوەکەی) هوروژمی کوردەکان بۆ ناو ئیران

## هاو پیچی ژمارە: ٤٥

### هەلبژاردە لە پەیامنیری ئەستەمولەوە

راپەرینی کوردستان: سەرچاوەکەی رۆژنامەی "Djeridei Havadis" ئەو باسەی خوارەوەی دەربارەی ئەو هۆیانەی ریگەیان خۆشکردوە یاخیبونی کوردەکان لە ئیراندا، بلاّوکردۆتەوەو، تیکراش خالی نیە لەشتی پر بایەخ. پەیامنیرەکەمان لە ئەستەمولّ دەلیت:

"لەمانگی رەمەزانی رابوردودا، حاکمی سابلاّخ، ئاغا شازادە ناردی بەدوی هەمزاغای سەرخیلی کوردی ناسراو بە مونکیور. هەمزاغا داواکەی بەجیهیناو، وەك پیشەی هەمو سالیکی، چەند ئەسپو ئیستریکی بەدیاری بۆ برد. بەلاّم بەریزی بەرامبەر کەمی دیاریەکە نارەزایی دەربریو، ئەوەندەش زۆر نەنگی پیشاندا کە هەمزاغا وای بەچاك زانی شارەکە جیهیلیت بەبیّ ئەوەی مۆلەت لە حاکم وەرگریت. کاتیّ ئاغا شازادە بە رۆشتنی هەمزاغا دەزانیّ، زۆر تورە دەبیّ‌و هەر دەستبەجیّ

کۆلۆنیل (سەرتیپ) موحەمەد سادق خانو کاپتن موحەمەد حسین خان بەختیاری، بەهێزیکی ٥٠٠ سوارەوە دەنیریت بۆ گرتنو هینانەوەی راکردوەکە. لەبەر ئەوەی هەمزە بەو کارانەی زانیبو بەرامبەری دەکرێ، ژمارەیەك لە ئەسپ سواری ئیلەکەی بانگ دەکاو پیکەوە هیزەکەی حاکم دەشکینن. کاتێ ئەم هەواڵە دەگاتە سابلاغ، شازادە دەستبەجێ دەکەویتە کۆکردنەوەی هیزیکی گەورەتر بۆ ئەوەی یاخیبونەکەی پێ دابمرکینێ. لەهەمان کاتدا، هەمزاغا زانیاری باشی دەبێ بەوەی کەچی بەرامبەری ئامادە دەکراو، بۆ ئەوەی خۆئامادەکردنی پیویستو بەپەلە جیبەجێ بکات بۆ بەرەنگاربونەوەی مەترسیەکەو، لە مەترسی ئەوەش کە ئەو ئەوەندە بەهیز نەبو کە بتوانیت بەتەنیا بەرامبەر هیزەکانی شا بوەستیت، دەنیریتو داوا لە شیخ عوبەیدوالله دەکات بۆ یارمەتیدانی. شیخ، عەبدوالقادری کوری بەهیزیکی ٢٠٠ سوارەوە دەنیریت بە هەنایەوە. سەرۆك کوردیکی تریش بەناوی کریم خان وە ئەداتە پاڵ هەمزاغا؛ هەرسیکیان بەهیزیکی ٨٠٠٠ سوارەوە بەرەو پیشەوە دەرۆن بۆ بەرەنگاربونەوەی حاکمی سابلاخ. حاکم، بەم هیزە زۆر گەورەیەی کە هەمزاغا هینابوی بۆ بەرەنگاربونەوەی، دەتۆقێو بەیاوەری چەند سوارەیەکی کەمەوە هەلدێ بۆ تەوریز. کاتێ هەمزاغاو هاوپەیمانەکانی دەبینن ریگاکە کراوەیە، بەرەو پیش دەرۆن بۆ سابلاخ، بەبێ ئەوەی هیچ بەرگریەك بەرامبەریان هەبیتو، لە کۆتایی ئەیلولدا دەیگەنێ. سەیری کرد (هەمزاغا) دانیشتوانەکان، کە هەمو کوردن، ئامادەن بۆ پیشوازیلیکردنی وەك رزگارکەریك لە ستەمی ئیرانیەکان، کە بە تایبەتی لەسەر مەسەلەی باج سەندن زۆر زۆرداربون. بۆنمونە "ماهیانە" هەبو کە باجیکی مانگانە بو؛ "سالیانە"، "عیدیانە" باجیك بو بۆ جەژن دەسیندرا؛ "نەڤرۆزە" باجیك بو بۆ جەژنی ٢١ ئازار؛ "موحەرەمیە" باجیك بو بۆ یەکەم رۆژی سەری ساڵ؛ "مولودیە" بۆ یادی لەدایکبونی پیغەمبەر، هتد.. لەبەر ئەوە کە دەیان بینی بەچ شیوەیەك لەلایەن کاربەدەستە ئیرانیەکانەوە دەچەوسینرینەوە، خەلکەکەی سابلاخ بەهەمو گۆرانکاریەك دلخۆش دەبون. سێ رۆژ پاش ئەوە، هەمزە گەمارۆیمیاندواو دەداتو پاش تیکشکاندنی هیزیکی ٢٠٠٠ سوارە لەژیر فەرماندەی عەلی خان ی حاکمی مەراغەدا، لە ١ی تشرینی یەکەمدا دەکەویتە ژیر دەست. لەم شەرەدا، مەلا موحەمەد جاف دەکوژرێو مەرکەمەت عەبادیش لەلایەن کوردەکانەوە بەدیل دەگیریت. لەو ساتەوە، هەمزەو هاوپەیمانەکانی دەکەونە کار بۆ پەلاماردانی شاری بۆ ناب. حاجی عەلی حاکم، بەهیزیکی ٣٠٠٠ کەسیەوە، بەرگریەکی خۆراگرانە دەکات، بەلام کوردەکان دەیشکینن و شارەکەش دەکەویتە ژیر دەستیانەوە. ئاغا خان، بە فەرماندەیی حەوت یان هەشت بەتالیۆنی نیزامیەوە، لەگەڵ هەشت تۆپدا دیت

بەنیازی پەلاماردانی کوردەکان. شەر دەست پیدەکاتو ٢٤ سەعات دەخایەنێ، لە کۆتاییشدا ئیرانیەکان تیکدەشکینو دەکەونە هەڵاتن. هەوالی ئەم تیکشکاندنە دەبیتە هۆی وروژاندنیکی زۆر لەناو تەوریزدا. موسی ئەفرەندین میرزای وەلیعە هدی شای ئیرانو حاکمی تەوریز کە لەو کاتەدا لەتاران دەبێ، فەرمان ئەدات بە ئیعتماد السلطنە تا بەهیزیکی گەورەوە بکشیتە سەر شۆرشگیرەکان. هەروەها کیچمە لوت دەولەی کرماشانیش فەرمانی پێ ئەدرێ کە دژ بە یاخیبوەکان بکشێ. ئەو شارانەی کە بەبێ بەرگریکردن تەسلیمی کوردەکان دەبن سابلاخ، ساقی، بانە، لاهیجان، سەرجان، چینو و بۆکان دەبن. هەمو ئەم شارو گوندانە، دانیشتوانەکانیان کوردن. ئەو شارانەش کە بە بەرگریەکی زۆرتر یان کەمتر لەلایەن شۆرشگیرەکانەوە دەگیرین ئەمانەن: میاندواو، مەرحەمەت ئاباد، مەراغە، ورمێ، ڤیناو سیراجە، هیچترود، ساتلمیچ، بوزلیك، بنەجەو، گیول ئودلو دانیشتوانەکانیشیان فارس دەبن. برازاکەی کورد عەزیز، کە کۆنە وەزیری جەنگی ئیران بو، داویەتیە پاڵ شۆرشگیرەکانو زۆر سەرەك ئیلو ئەفسەری تریش بەهەموو تفاقیکەوە خۆیان داوەتە پالیان.

## ژمارە: ٤٦

### لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گانڤیل

### (بەبروسکە لە ٢٤ی تشرینی دوەمدا گەیشتوە)

گەورەم، تاران، ٢٣ی ت٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بە جەنابتان رابگەیەنم کە ئەم بەیانیە شا بۆ دیمانەیەکی رەسمی ناردی بەشوینمداو، جاریکی تریش دەربارەی سەرهەلدانی کوردەکان قسەی بۆ کردمەوە. شا دەیگوت حکومەتی ئیران زانیاری پیگەیشتوە کە کوردەکان لە کۆتاییدا لە سابلاخو ناوچەکانی ئەو نزیکانە دەرپەریندراونو ئیستا ئەو هیزانە داگیری کردون کە لەم دواییانەدا لە تارانەوە نیردرابونو، شیخ عوبەیدوالڵەش کە هیزەکانی ئیران بە فەرماندەیی تەیمور پاشاخان لەدەشتی ورمێ دوجار شکاندویانە، رایکردوە بۆ ناوچەیەکی نزیك مەرگەوەر لەسەر سنور، کە خۆیو عەبدوالقادری کوری لەگەڵ لقەکەی ئیلی شکاکی کورد لە ئیران پەنایان بۆ بردوە. ئیقبال الدولەو تەیمور پاشاخان، لەم کاتەدا بۆ دۆلی مەرگەوەرو برادۆست کشاون بەدوای شیخ داو، سوپاسالاریش کە بەیانی دەگاتە سابلاخ، لەچەند رۆژیکی کەمدا دەروات بۆ ورمێو لەویشەوە گەر پیویست بیت بۆ ناوچەکانی شکاك. هەولئەدەن لەناو خاکی ئیراندا شیخ بگرن، بەلام بە بۆچونی خاوەن شکۆ، زۆر لەوە دەچێ، شیخ کاتێ بینیویتی هیزەکانی ئیران گوشاری زۆریان خستۆتەسەر، جاریکی تریش سنوری بەزاندۆتەوە

بۆ ناو توركیا. شا وای هەستدەكرد كە بابی عالی بەرپرسیاربێ بۆ هەمو ئەوەی كە رویداوە. یاخیبونەكە، شیخ لە توركیا نەخشەی بۆ كیشابو و ریكی خستبو؛ ئەمیش وەك رەعیەتیكی تورك، كاربەدەستەكانی توركیا هیچ شتیكیان لینەكردبو بۆ ریگەگرتن لە هینانەدی ئامانجەكانیدا. بە پیچەوانەوە، ریگەی پیدرابو كە بانگەوازەكەی دەربكاتو لەخاكی توركیاوە وتاری ئاگرین بنیریت بۆهەمو ئیلە كوردەكانی ئەم لایەی سنور، سەرباری ئەو نیگەرانیەش كە ئیران لەسەر مەسەلەكە دەریئەبری، لە كۆتاییدا ریگەی پیدرا لە سنور بپەریتەوەو خۆشی بەسەركردەی یاخیبوەكان دابنیت. خاوەن شكۆ وایدەزانی كە بابی عالی لەم كاتەدا هەمو هەولیك ئەدا بۆ ساریژكردنی ئەو برینەی رەعیەتەكانی بۆ ولاتەكەیان دروستكردوە. بەهەر حالّ، ئەو لەوە دەترسا كە ئەگەر لەژیر فشاری ناوبژیكەرە زلهیزەكاندا نەبیت، ئەم كارە ناكریتو، بەو هیوایەش بو كە حكومەتی خاوەن شكۆ بە توندی دنەی بابی عالی بدات بۆ گرتنی شیخ عوبەیدوالله، یان ئیعدام بكریت، وە یان دوربخریتەوە بۆ شوینیكی دوری ناو ئیمپراتۆریەتەكە، كە نەتوانێ هیچ زەرەریك بگەیەنێ، وە یانیش ریگە بە ئیران بدریت هیزەكانی لەو دیو سنورەوە بنیریت بۆ هاوكاریكردن لەگەلّ هیزەكانی توركیادا بۆ گرتنی سەركردە گەورەكانی سەرهەلدانەكە.

شا دەیگوت گەر بابی عالی نەخوازیت وە یان نەتوانیت ئەم پیشنیارانە جیبەجێ بكات، ئەوا ئالۆزی زۆر پەیدا دەبی كە زەرەربەخش دەبن بۆ بەرژەوەندی گشتی. تەنانەت ئامارژەی بۆ ئەوە دەكرد كە ناچار دەبیت داوا لەهیزەكانی ئیران بكات سنور ببەزینن بۆ گرتنی شیخ عوبەیدوالله لەناو خاكی توركیادا. لەكاتیكدا كە مەحكوم كردنەكەی دوپات دەكردەوە، گوایا روسیا بەكردار دەست وەردەدا لەم مەسەلەیە، شیوەی تیبینیەكانی هەندێ گریمانی لەیەك گەیشتن بۆ كاری هاوبەش لەخاكی هەردو زلهیزەكەدا پیشان ئەدات.

وا پیدەچێ، داوای حكومەتی ئیران سەبارەت بەگرتنو دورخستنەوەی شیخ عوبەیدوالله نەرمو (معتدل) مەعقول بیت، خۆ ئەگەر ئەم داوایە قوبولّ نەكرا، لەوانەیە یاخیبونەكە بەهاری داهاتو دەست پیبكاتەوە. بەرگریكردنی بەردەوامی شیخ لەنزیك سنورەكە، پیویست بەهیشتنەوەی هیزیكی گەورەی ئیران دەكات لە ناوچە سنوریەكانی ئازەربایجانداو، لەم كاتەشدا، بونی هیزیكی ئاوها لەم بەشەی ولاتەكەدا نەك تەنها مەسرەفیكی قەبە دەخاتە سەر حكومەتی ئیران، بەلكو بەتەواوی ئەو زەخیرەو خواردەمەنیە زۆر كەمەی ناوچەكەش وشك دەكات كە قاتوقریەكەی سالی پارو تالانیو ویرانكاری كوردەكانیش لەو دو مانگەی دواییدا وای كردبو، كە بەشی پیداویستی دانیشتوانەكان نەكات.

هەردو زلهیزی محمدیان وەك یەك پییان باشە كە نیزام لەناو خیلە كوردەكانی سەر سنوردا راگرنو، هەردوكییان دان بەوەدا دەنین كە حەزدەكەن بگەنە هەندێ لە یەكگەیشتن سەبارەت بەمەسەلەكە.

حكومەتی ئیران، ئیستا راستگۆیی بابی عالی لەم بارەیەوە هەلدەسەنگینێو ئەوەیش بەو پیوانەیەی كە كاربەدەستە توركەكان سەبارەت بەشیخ عوبەیدوللەو سەركردە گەورەكانی سەرهەلدانەكەی ئیستا دایاننناوە. بیگومان، ملدان بەداواكانی شا، كارەكانی داهاتو ئاسان دەكات سەبارەت بە سەقامگیركردنی ئاشتی لەنیو دانیشتوانی كوردستاندا لە هەردو لای سنوردا؛ بەلام گەر رەت كرانەوە، ئەوا بەهۆی ئەو هەستو ریزە زۆرەی لەم ولاتەدا هەیە بۆ شیخو ئەو تەشجیعەش كە بابی عالی دەیكات، ئەوە من زۆر بەدوری دەزانم، لە حالەتی سەرهەلدانی دوژمنایەتی لەنیوان توركیاو روسیادا، ئیران جاریكی تر بە بێلایەنی بمینیتەوە وەك لەماوەی ئەم دو سالەی جەنگەكەیاندا پیرەوی كردبو.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ٤٧

له مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل

(لە ٢٤ی تشرینی دوەمدا بە بروسكە وەرگیراوە)

گەورەم، تاران، ٢٤ی ت٢، ١٨٨٠.

نیشانە بەنامەكەم لە ٢٠ی ئەم مانگەدا ئەو زانیاریەم تیا دوپاتكردبۆوە كە لە كۆنسۆلی گشتی حكومەتی خاوەن شكۆ لەتەوریز پیم گەیشتبو سەبارەت بە جموجولی هیزەكانی روسیا لەسەر سنوری ئیران، شەرەفی ئەوەم هەیە بە جەنابتان رابگەیەنم كە لە چاوپیكەوتنیكدا كە دوینێ لەگەڵ هاوكاری روسیدا كردم، پیی راگەیاندم كە فەوجیكی قوزاكەمان، نزیكەی ٥٠٠ كەسی بەهیز، گەیشتونەتە جەلفا.

مستەر زینوڤییڤ دەیگوت، لەوانەیە فەوجیكی تریش بۆ ئەوێ بنیردریت، هەرچەندە لەوەش دەچێ كە بەهۆی نەبونی هیچ پیداویستیەك لێی، ئەو كارە برەخسێ.

هەروەها لەسەری رۆیشتو وتی، كە هیچ هیزیكی روسی نەچوە بۆ سنوری ئیران.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ٤٨

**لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ مستەر گۆشن**

**بەریز،                                                وەزارەتی دەرەوە، ٢٤ت٢، ١٨٨٠.**

**بروسکەیەکم لە مستەر تۆمسن وە کە بۆ جەنابیشتان دوبارەکراوەتەوە، پیگەیشتوە، باس لە گفتوگۆیەك دەکات کە لەگەڵ شادا سەبارەت بە یاخیبونی کوردەکان، کراوە.**

**خاوەن شکۆ دەلیت، شیخ عوبەیدواللە ئیستاکە شکیندراوەو، سورە لەسەر ئەوەی (شاە) کە دەبێ بابی عالی یان شیخ بگریتو سزای بدات، وەیان تەسلیمی بەکاربەدەستە ئیرانیەکان بکاتەوە، وەیانیش ریگە بەهیزەکانی بدات لەسنور بپەرنەوەو لەگەڵ هیزی عوسمانیەکاندا هاوکاری بکەن بۆ دەستگیرکردنی سەرکردە بالاّکانی سەرهەلدانەکە.**

**لەوانەیە بەریزتان لەم بارەیەوە ئامۆژگاری بدەن بەبابی عالی، بەو شیوەیەی دەزانیت بارودۆخەکە پیویست دەکاو، ئەو رونکردنەوانەش کە بۆ حکومەتی تورکیای دەکەیت، بە حکومەتی خاوەن شکۆی رابگەیەنە.**

**(ئیمزا) گرانڤیل**

## ژمارە:٤٩

**لە مستەر پلەنکیتوە بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(لە ٢٤ی تشرینی دوەمدا بە بروسکە گەیشتوە)**

**گەورەم،                                    سانت پیتەرسبورگ، ٢٤ی ت٢، ١٨٨٠.**

**لەمیانەی گفتوگۆکەی ئیمرۆدا، بارۆن جۆمین پیی راگەیاندم کە ئەو دو راپۆرتەی لە کوردستانەوە پیی گەیشتون، زۆر شوینی رەزامەندی نەبون.**

**پرسم کرد گەر ئەمە هیچ جیاوازیەك بکات لەو خۆ ئامادەکردنە سەربازیەی کە روسیا لەسەر سنوری ئیران دەیکرد.**

**بارۆن جۆمین گوتی، لە حالی حازردا لەو باوەرەدا نیم. ئیرانیەکان، ئەوەندەی بتوانن بەرەنگاری کوردەکان ببنەوە، ئەوا پیویست ناکات هیزەکانی روسیا لەسنور بپەرنەوە. بەلاّم ئەگەر ئیرانیەکان تیکبشکین، ئەوا بارودۆخەکە مەترسیدار دەبیت.**

---

**بروانە ژمارە: ٤٦**

## ژماره:٥٠

**له مستەر تۆمسن وه بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(بە بروسکە لە ٢٥ی تشرینی دووەمدا گەیشتوە)**

**گەورەم،** **تاران، ٢٥ی ت٢، ١٨٨٠.**

**ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە پێیان رابگەیەنم کە ساتێکی کەم لەمەوبەر بروسکەیەکم لە کۆنسۆلی گشتی حکومەتی خاوەن شکۆ لە تەوریز پێگەیشت، دەڵێت**

**(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن**

## ژماره: ٥١

**له مستەر گۆشن وه بۆ ئیرل گرانڤیل (لەکاتژمێری ٨ سەرلەبەیانی ٢٦ی تشرینی دووەمدا وەرگیراوە)**

**(بە بروسکە)** **ئەستەموڵ، کاتژمێری ١١,٤٠، ٢٥ ت٢، ١٨٨٠.**

**سەبارەت بە شێخ عوبەیدوڵڵە، رونکردنەوەی زیاترم بۆ بابی عالی کردوەو، وەزارەتی دەرەوەش پێی راگەیاندم کە کومیسیونێك پێکدەهێنرێت بۆ دادگاییکردنی شێخ، کورەکەیو هەروەها شۆڕشگێری ترو باسکردنی کاروبارەکان. من بەردەوام دەبم لەسەر جەخت کردن بۆ سزادانی ئەو شۆڕشگێرانەی کە جەنگیان لەسەر زلهێزێکی دۆست بەرپا کردوە.**

**سولتان بەسەفیری ئێرانی راگەیاند کەنوێنەرێکی ناردوە بۆقەناعەت پێکردنی شێخو گەرانەوەی بۆ ناو خاکی تورکیا، ئەمەش وەك سەفیرەکە بۆی دەچو، زۆر شوێنی رەزامەندی نەبو.**

## ژماره: ٥٢

**له مستەر تۆمسن وه بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(بە بروسکە لە ٢٨ی تشرینی دووەمدا گەیشتوە)**

**(هەڵبژاردە)** **تاران، ٢٨ی ت٢، ١٨٨٠.**

**هەر ئێستا، بروسکەیەکم لە کۆنسۆلی گشتی حکومەتی خاوەن شکۆ لە تەوریز، بە بەرواری دوێنێ، پێگەیشت، باسی گەیشتنی نێردراوێکی ئێرانی لە سابڵاخ وە دەکات کە هەواڵی لە کامپەکەی ئێرانەوە هێنابو، دەڵێت سوپاسالار ئیجرائاتی کاریگەری کردوە بۆ رێگەگرتن لە تجاوز لەلایەن هێزەکانی ئێرانەوە.**

هــەروەها رادەگەیــەنیت کــە، ئیلــی موکــریو ژمارەیــەکی زۆر لەســەرەك خیلــە کوردەکانی تـر، پەنایان بردۆتـە بەر تەویلەکـەی سوپاسـالارو خۆیـان بـە حکومـەتی ئیران تەسلیم کردوە.

## ژمارە: ٥٣

لە مستەر پلەنکیت وە بۆ ئیرل گرانڤیل

(لە ٢٩ی تشرینی دوەمدا، بە بروسکە وەرگیراوە)

(هەلبژاردە) سانت پیتەرسبورگ، ٢٩ی ت٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپیچ، هەلبژاردەی یاداشتیکی تایبەتیت بۆ بنیرم کە لەبارۆن جۆمینوە پیم گەیشتوە.

بارون جۆمین پیم رادەگەیەنێ کە بروسکەیەك لەتارانەوە ئەوە باسدەکات کە شیخ عوبەیدوالله دوای ئەوەی لەلایـەن ئیرانیەکانـەوە تیکشکیندراوە، بلاویکردۆتـەوە کـە واز لە نەخشەکانی دەهینیت.

بروسکەکە زیاتر دریژەی پیدەدات، گوایە شیخ داوا لە حکومەتـەکانی بەریتانیاو روسیا دەکات هانی بابی عالی بدەن بۆ پیویستی ئیجرائات وەرگرتنی توند بۆ گرتن، چەککردن، وە سزادانی ئەو کوردانەی گوناحباربون. تەنها دوای ئەمەیە کە بتوانرێ کاریك بکرێ بۆ پیاچونەوەی گازەندە رەواکانی کوردەکاندا.

## هاوپیچی ژمارە: ٥٣

لەبارۆن جۆمینوە بۆ مستەر پلەنکیت

(هەلبژاردە) سانت پیتەر سبورگ ٢٩\٧ ت٢، ١٨٨٠.

بە بروسکەیەك لە تارانەوە پیمان راگەیەندراوە کە شیخ عوبەیدوالله دوای ئەوەی لەلایەن هیزەکانی شاوە تیکشکیندرا، بلاوی کردۆتەوە وازی لە ئامانجەکانی هیناوە. شا داوا دەکات کە ئینگلستانو روسیا هانی بابی عالی بدەن بۆ ئـەوەی ئیجرائـاتی تونـد بکـات بـۆ گرتــن، چــەککردن وە ســزادانی گوناحبارەکــان. تەنــها دوای ئەمــە دەتوانریت کاریك بکریت بۆ پیاچونەوەی گازەندە رەواکانی کوردەکاندا.

## ژمارە: ٥٤

لە مستەر گۆشن وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە یەکی کانونی یەکەمدا وەرگیراوە)

(هەلبژاردە) ئەستەمولّ، ٢٦ ت٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپێچ سێ نامەت بۆ بنێرم لە جێگری کۆنسوڵ، کلایتن وە، سەبارەت بە هوروژمی کوردەکان بۆ ئێرانو ئەو جموجولە سەربازیانەی کە کراون. ئێستا، هۆ روکەشییەکانی هوروژمەکە تەواو ئاشکرایە، بەڵام وا دەردەکەوێ هێشتا غموضی زۆر دەوری دو پرسیاریان دابێت، ئایا شێخ عوبەیدوڵلە بە راستی نەخشەیەکی بەربڵاوو طموح جێبەجێ دەکات؟ دەبێ هەستی حکومەتی عوسمانی سەبارەت بە بزوتنەوەکە، ئەوەندەی کە ئەوان بەئاگان لێی، چییە؟ من ئەو هەنگاوانەم بە سەفیر راگەیاندوە، کە لەگەڵ وەزیرەکاندا ناومە بۆ پشتگیریکردنی داوای ئێرانییەکان کە تورکەکان لای خۆیانەوە کاریگەر بکەنو، نیازی خۆشم کە جەختم کردوە، بۆ کردنی ئیجرائاتی توند بۆ سزادانی شێخو کورەکانی.

لەو کاتەوە، من دوبارە دەربارەی مەسەلەکە پەیوەندیم بە عاسم پاشاوە کردۆتەوە. پێی راگەیاندم کە بابی عالی پێشنیار دەکات بۆ ناردنی کۆمیسونێك بۆ لێکۆڵینەوە لە رەفتاری شێخو سەردارەکانی تریش:

بەوەی کە ئەوانە شۆڕشگێر بون نەك دزو جەردەو دەبێ دادگایی بکرێن. بەڵام لە راستیدا ئەنجومەنی وەزیران هێشتا لەسەر نامەکەو کۆمیسۆنەکە بریاری نەداوە. من سبەینێ بەرێزی دەبینمو جەخت دەکەم لەسەر رونکردنەوەی زیاتر بەوەی کە ئایا بابی عالی چی دەکاتو باسەکانم لەسەر ئەو بەرپرسیاریتییە دەبێت کە روبەرویان دەبێتەوە، گەر نەیانتوانی سزایەکی ئەوتۆی ئەو رەعیەتانەی خۆیان بدەن بە جۆرێك ببنە پەند، لەبەر ئەوەی جەنگیان دژ بە وڵاتێکی دۆست بەرپا کردوە.

## هاوپێچی ١ی ژمارە: ٥٤

### لە کاپتن کلایتن وە بۆ مەیجەر ترۆتەر

بەرێز، وان، ١٩ی تشرینی یەکەم، ١٨٨٠.

بەهەمو حسابێك، وا پێدەچێ کە ئێلە کوردەکان بە فەرماندەیی شێخ عوبەیدوڵلە بەردەوام بن لە چونە پێشەوەیاندا بۆ ناو خاکی ئێران. دوێنێ، والی بروسکەیەکی پێشان دام کە لە تارانەوە پێی گەیشتبوو، دەڵێت خێلە ئێرانییەکان دەچونو دەیاندایە پاڵ هێزەکانی شێخو، حکومەتی ئێرانیش لەشکری دەنارد، بەڵام ئەوەندە بەهێز نەبون کە بتوانن بەرامبەر کوردەکان بوەستن. کاربەدەستە تورکەکان نێردراوەکانی خۆیان دەنێرن بۆلای شێخ بۆ ئەوەی هەولبدەن شێخ تەفرە بدەن واز لەو رێگەیە بهێنێت، بەڵام والی دەیگوت من لەم باوەرەدا نیم شێخ گوێیان لێ بگرێت.

هەروەها نامە نێردراوە بۆ موتەسەریفو قایمقامەکانی هەکاری کە رێگە نەدەن سەرەك هۆزەکانی ئەو سنجقە پاڵ بدەنە شێخ، بەڵام من باوەرم وایە کە ئەوە شتێکی

پر گومانە کە ئەوەندەیان دەسەلات هەبیت بتوانن ئەو کارە بوەستینن. لەهەمان کاتدا، لە پینج بەتالیۆنەوە بۆ هەشت بەتالیۆن ئاراستە دەکریت بۆ ئیرە، چونکە لەحالی حازردا سێ بەتالیۆن لە واندا هەیە. نیاز وایە لەم کاتەدا ئەم لەشکرانە لیرە بمیننەوەو چاوەروان بن بزانن مەسەلەکان بەکویدا دەکەون، بەلام چەند بەتالیۆنیکیش دەنیردریت بۆ باشقەلاو گەوەر بۆ پیکهینانی ئەمباری زەخیرە، نەبادا پیویست بکات لەویوە هیز بنیرن.

فەریق، موسا پاشای فەرماندە لەموش، گەیشتۆتە ئیرەو بریار وایە بچیت بۆ هەکاری.

گومان لەوەدا نیە کە بزوتنەوەی کوردەکان شتیکی جدیەو مەترسی گەورەش هەیە کە ئەگەر خیلە درندەکان لەگەڵ پاشکەوتوەکانی ئیراندا بەیەك بگەن، وا هەلدینو لە سنورەوە دەپەرنەوە بۆ هەکاری. من هەروەها بیستومە کە گومان دەربراوە سەبارەت بەوەی ئایا لەشکر داوا دەکریت کە ئەو کارە دژی کەسایەتیەك بەو ریزە بەرزەوە وەك شیخ، بکات.

ئەمانە، هەمو سەرنجی دەسەلاتدارەکانی داگیرکردوەو، لەبەر ئاسایشی ولاتەکە ریگەیان گرتوە کە کاریکیان بۆ بکریت. بە بەردەوامی راپۆرتی تازە دیت لەبارەی تالانی کوردەکانەوە، بەلام هیچ هەنگاویك نانریت بەرامبەریان. هەمیشە پیویستی پارەو پیاو بەهۆیەك دانەنریت کە بۆچی ئەوەندە کەم کار دەکریت. زەبیتەکان هاواری موچەیانەو رەفزی ئەوە دەکەن فرمانەکان جیبەجێ بکەن تا موچەیان نەدریتێو، ئیستاش هەرچی شتیکیان لە ئەستەمولەوە لی داوا دەکرێ، بێ هودەیە. بۆ ئەوەی خەرجیەکان مسۆگەر بکریت، دەبیت بەرهەمی دەیەك بفرۆشریت، لەبەر ئەوە، ئیمساڵ هیچ یارمەتیەك لە حکومەتەوە بۆ ئەو ناوچانەی توشی قاتو قری بوە، نابیت.

بەشیوەیەکی گشتی، ولاتەکە لەبارودۆخیکی ناجیگیردایە، بەلام لەوانەیە کەمتر لەمانگیك بەفر بباریت، ئەوسا وەك پیویستە لەشکر کیشی کوردەکان کەم دەکات.

(ئیمزا) ئیمیلیەس کلایتن

## هاوپیچی ٢ی ژمارە: ٥٤

لە کاپتن کلایتنەوە بۆ مەیجەر ترۆتەر

بەریز،　　　　　وان، تشرینی یەکەم، ١٨٨٠.

هەندێ دریژەی ترم (تفاصیل) سەبارەت بەراپەرینی کوردەکان دژ بە دەسەلاتدارەکانی ئیران، پیگەیشتوە. یەکەم شت، پیویستە ئەوە بزانریت کە لە

**دەوری ســابلاخدا ئــەم خیلانــەی لای خــوارەوە هــەن: لای بــاکوری رۆژهــەلات و رۆژهەلاتـەوە، میکری (Mikry) کە پیکهاتوە لـە ۲,۰۰۰ مـاڵ؛ لـە باشـورەوە میوکـری (Meukury)، ٥,۰۰۰ ماڵ؛ لای باشوری رۆژئاواوە، مامش ۳,۰۰۰ ماڵ؛ لای بـاکوری رۆژئاواوە نزیك شنۆ، زازا ۱,۰۰۰ ماڵ؛ وە لای باکورەوە نیوان سابلاخو دەریاچـەی ورمێ کارەپاپاڤ ۳,۰۰۰ ماڵ. لەمانە، چوارەمی یەکەمیان کوردنو سونین، بەلام قەرە پاپاڤەکان شیعەی ئیرانین.**

**کاتیك سەرۆك هۆزی کورد، هەمزە لە سابلاخ هەلات، پاش دەربازبونەکەی یەکەم جار رۆیشت بۆلای موکریـەکان (Meukry)، ئەوانـەی کـە بـو بـە سـەرۆکیانو پاشـان هەندێ پیاوی ئەساسی لەگەڵ خۆی بردو رۆیشت بۆ لای ئیلی مامشو، راویـژی بە سەردارەکەیان کرد. شتیکی ئاشکرایە کە نارەزاییەکی زۆر بـەربلاو هەیـە بەرامبـەر فەرمانرەوایی ئیرانیو، سەرداری مامش یش رازی بو کە بۆ شۆرش بداتە پاڵ هەمزە. پاشان رۆیشتن بۆ شنۆ، کە عەبدوالله خانی سەرداری زازا حاکم وەیان پاریزگاریتی، واتیدەگـەن، خوشـکەکەی عەبدواللــە خــان، ژنــی شــیخ عوبەیدواللەیــە؛ لەهــەمو حالـەتیکدا، تیکەلیـەك (پەیوەندیـەك) لـەنیوانیاندا هەیــە. ئــەم عەبدواللــە خانــە، بەشیوەیەکی زۆر خراپ رەفتاری لەگەلدا کرابو لەلایەن حاکمە ئیرانیەکەی ورمێوە، کە بەهۆی هەندێ بیانوەوە ناردبوی بەدوایدا، ئینجا گرتبوی، ۱۰۰۰ جەلدەی لیدابو، وە تەنها دوای ئەوەی غەرامەیەکی زۆریشیان لیسەندبو، ئینجا رییان پیدابو بروات. لەبەر ئەوە، بەخۆشیەوە رازی بو بەوەی بداتە پاڵ دو سەدارەکەی تـرو، بریاریـاندا هانا بەرن بۆ عەبدوالقادری کورەکەی شیخ عوبەیدوالله، کە لە مەرگەوەر دادەنیشێو لەلایەن ئیرانەوە کراوە بە فەرمانرەوای سەرەکی ناوچەکانو خیلەکانی نزیك سنور. عەبدوالقادر پشتگیری لە مەسەلەکەیان کردو، دوای ئەوەی پیاوەکانیان کۆکردەوە، کەوتنە کشان بۆ سەر سابلاخ. کاتیك بەسەر ریگاکەیاندا بە قەرەپەپاغدا تیپەرین، خەلکەکەی لەترسی ئەوەی لەناو نەبرین، بەناچاری دایانە پالیان. ئیلـی میکریـش (Mikry) هەروەها دایانە پالیان، بەلام ئاشکرا بو بە نابەدلیەوە بو. ئینجا سابلاخ بە تـەواوی گـەمارۆ درا، حاکمەکـەی کـە بــەخوین مـیربو، لەگــەڵ دەسـتوپیوەندەکەیدا لەناوەوە قەتیس مان. بە هەرحاڵ، سەرداری میکری، وەك ناوبژیکەریك کاری کردو ریگە بە میرو دەستوپیوەندەکەی درا کە برۆنو چەکو تفاقەکانیان جێ بهیلن. پاش ئەمە، بەبێ ئەوەی یەك فیشەك بتەقینریت، سابلاخ تەسلیم بو. ئینجا عـەبدوالقادر ناردی بەدوی ئیلەکانی باشورو باشوری رۆژهەلاتدا، تا دەگاتە بانەو سەقز، داوای لیکردن تەسلیمی ببن. ئەوانیش گوێ رایەلی داواکەی بـونو، پاشـان حکومـەتیکی هەریمی ریکخست، بەدانانی حاکم بۆ ئەو ناوچانەی تەسلیم ببون. دوای ئەوە، لـە**

سابلاخ وه پیشرەوی کرد بۆ روباری تاتاو، که ولاتەکه دابەش دەکات بەسەر ئەو شوینانەی که کوردەکانی به شیوەیەکی سەرەکی لی نیشتەجیّیە، لەگەلّ ئەوانەی که تایبەته به دانیشتوانه ئیرانیەکانی. واباس دەکرا، که لیره ۲۰,۰۰۰ کەسی لەگەلدا بوه، بەلام ئەم ژمارانه متمانەیان ناخریته سەر. دوای ئەوه ناردی بۆ مەرحەمەترادو داوای کرد تەسلیم بیت. بەهۆی ئەوەی رەفزیان کرد تەسلیم بن، گەمارۆ، پەلاماردراو لەو ۱۰۰۰ مالەی هەیبو، ۳۰۰ مالی تالانکرا. دوا زانیاری وا دەگەیەنیت که عەبدوقادر به چەند تۆپیك لەنیوان مەرحەمەتەرادو مەرەگەدایه، لەگەلّ تەقەمەنی تری جەنگدا که کەوتونەته دەستی. واباسدەکریت که ئیرانیەکان تەقەلایەکی زۆر دەکەن بۆ ئەوەی بەرامبەر بەم شۆرشه بوەستن. سیّ تابور پیکهینراوه، دوانیان لەتارانو تەوریزەوه بۆ سەر هیزەکانی عەبدوالقادر کۆ دەبنەوەو، ئەوی تریشیان بەلای رۆژئاوای دەریاچەی ورمیدا ریّ دەکات (دەروات) بۆ هەرەشەکردن له پاشەکشییان. رۆژانه هەوالی شەریکی قورس چاوەروان دەکریّ.

وا باسدەکریت دو فەیلەقی کوردی تریش له شەرگەکەدا هەبن، یەکیکیان به فەرماندەیی کوره گەورەکەی شیخ دایه لەنزیك مەرگەوەر، ئاشکرایه بۆ پاراستنی کشانەوەی عەبدوالقادرەو، ئەوی تریشیان به فەرماندەیی خەلیفه سەعیدەو له شوینیکدایه لەنیوان گەوەرو ورمیدا. سەعید لەگەلّ نیردراوی تردا هاتبو بۆ لای کوردەکانو، پیی راگەیاندبون که تورکەکانیان لەگەلدایەو چەکو تفاقیان دەدەنیّو، ئیستاش کاتی ئەوه هاتوه که هەمو ئەو شتانەی عەلی خان لیی زەوت کردبوین (بەتالان لیی بردبون) لیی بسەندینەوه.

ژمارەیەکی لەبەرچاو دایانه پالّ هیزەکەی سەعید، بەلام کاربەدەسته تورکەکان هەرەشەیان لیکردون که نەچنه پالّ ئەم بزوتنەوەیەو، زۆریشیان گەراونەتەوه بۆ مالەکانیان.

بەهۆی ئەوەی ئەو حاکمه ئیرانیەی ورمیّ لەلایەن حکومەتەکەیەوه لۆمه کراوه بۆ ئەو روداوانه، بەوەی که بەرپرسیار بوه لەدانانی عەبدوالقادردا، دەستی لەکار کیشاوەتەوەو هانای بۆ عەبدوقادر بردوەو خەلکەکەی ورمیّش ملیان بۆ شیخ دانەواندوەو، باوەریش وایه که یان هیزەکەی ژیر فەرماندەیی سەعید وه یان ئەوەکەی کوره گەورەکەی شیخ دەروات بۆ ورمیّو دەیخاته ژیر دەستی.

ئیمرۆ لەکاربەدەسته تورکەکانم بیستوه که شیخ عوبەیدوالله خۆی له سنور پەریوەتەوه بۆ ناو ئیران، بەلام ئەمانه دەلین شیخ بلاوی کردۆتەوه، ئەو هیچ کاریکی نیه بەم راپەرینەوه، بەلام کورەکانی به پیچەوانەی خواستی ئەوەوه کار دەکەن. بیگومان، پیویسته ئەم بانگەوازه لەبەرچاو بگیردریت.

هـيزی قـايمكردنی تـازەی زۆر بـەرەو ئـيرە ئاراسـتە دەكريـت. دابەشـكردنی لەشكرەكان لەولايەتی واندا وەك لای خوارەوەيە:

گـەوەر، ٢ بـەتاليۆن، ٤ تۆپـی شـاخ؛ باشـقەلا، ١ بـەتاليۆن، ٢ تۆپـی شـاخ؛ جولەميرگ، ١ بەتاليۆن، ٢ تۆپی شاخ؛ وان، ٤ بەتاليۆن، ٤ تۆپی شاخ.

هەروەها ژمارەيەكی بچوكی سوارەش لە خالی هەمە جۆردا هەن.

ويرای ئەم هيزانەش پيم راگەيەندراوە كە دو بەتاليۆن لەديار بەكرەوە بەرەو ئيرە بەريوەيـەو دوانيـش لـە ئەرزبخانـەوە، لەكاتيكدا كـە ٤ی تريـش هـەر لـە ئەرزبخانـەوە فەرمانييان پيدراوە ئامادەبن بۆ كەوتنەرێ.

پيدەچيت مەسەلەكان لە كيشەو گرفت نزيك ببنەوەو، بەشيكی زۆريش بەندەبيت لەسـەر ئاكـامی پيكـادانيك لـەنيوان ئيرانيـەكانو هيزەكـەی عـەبدوالقادردا. ئەگـەر ئەوەكـەی دواوە (عـەبدوالقادر) سـەركەوتو بـو، وا ئەنجامـەكان زۆر مەترسـيدار دەبـن، بەلام ئەگەر تيكشكيندرا، ئەوا لەوانەيە جولانەوەكە بەخيرايی هەرەس بينيت، چونكە بيگومان ئيلەكانی ميكریو قەرپەپاغو، لەوانەيـە، ئيلـی تريـش، هـەر دەسـتبەجێ لی ی بكشينەوەو مەترسی تالانكردنی بێ ياسايیو كاولكردن لەلايەن ئيلە لەيـەك تـرازاو و پەرەوازەكانەوە بيتە كايەوە.

ئەو زانيارييانەی لەسەرچاوەی ترەوە بە من دەگەن، جەخت لەسەر ئـەو هەوالانـەی سەرەوە دەكەن، بەلام واتەواتی زۆر دژ بەيـەكيش هەنـە، كـە لەوانەيـە پيوەنـانی زۆری پيوەبێ، لەهەردو ژمارەی هيزی كوردەكانو چەندايەتی ئەو سەركەوتنانەی پەيوەست بوە پيوەيان؛ بەلام، من لەو باوەرەدام ئاشكرايە، كە مەسەلەكە زۆر بەجدی دادەنريت.

(ئيمزا) ئيميليەس كلايتن

## هاو پيچی ٣ی ژمارە: ٥٤

لە كاپتن كلايتن وە بۆ مەيجەر ترۆتەر

بەريز، وان، ٢٧ی تشرينی يەكەم، ١٨٨٠.

دوينـێ مالی پيی راگـەياندم كـە بروسـكەيەكی لـە ئيرانـەوە پيگەيشـتوە دەليـت پيكـادان لـەنيوان ئيرانيـەكانو كوردەكـاندا رويـداوەو، كوردەكـان شـكيندراونو زيـانی ٣٠ كەسيان بوە. بەلام زۆر لەوە دەچێ كە پيكادانەكە شەريكی گشتی بوبێ.

هـەروەها زانيـاريم پيگەيشـتوە كـە، كـاتيك هـيزی كوردەكـان بەرپـەرچ ئەدرانـەوە، شيخ موستەفا، كە يەكيكە لە خەليفەكانی عوبەيدوالله، لەگـەل ٣٠٠ كەسـدا لەبـەردەم

گوندی جیهانگیر ئاغادا وه دەرکەوتنو گوتی گوندەکە دەسوتینی گەر خەلکەکەی نەدەنە پالیانو، ناچاریش بو ئەو کارە بکات.

هەروەها بیستومە کە زۆر لە نەستۆریەکانی شەمدینان کە بدەنە پاڵ هیزەکانی شیخ.

ئەو کوردانەی هاتونەتە وان دەلین، شیخ عوبەیدوالله ناردویەتی بەدوی خەلکیداو داوایان لیدەکات دژی ئیرانیەکان راپەرنو، واتەواتیش هەیە کە شیخ دوای ئەوەی لە ئیرانیەکان دەبیتەوە، لا ئەدات بۆ سەر تورکەکان. من لەو باوەرەدام کە ئەو (شیخ) پلانیکی بەربلاوی هەیە بۆ یەکخستنی هەمو کورد لە ولاتیکی سەربەخۆدا بە سەرۆکایەتی خۆی. یەکەم شت، هەلومەرجەکان سەرنجیان بۆ لای کوردستانی ئیران راکیشاوەو، هەولئەدات حکومەتی ئیران ناچار بکات وەك فەرمانرەوای کوردەکانی ئیران دانی پیادابنیت و، پاشان لائەداتەوە بۆ ئەم تەرەفەو هەولئەدات مافەکانی لە تورکەکان وەدەست بهینێ.

دو بەتالیۆنی زیاتریش بەخیرایی دەکەونە رێ بۆ هەکاری.

واتەواتی ئەوە هەیە کە روسەکان لەشکر دەنیرن بۆ کۆمەکی ئیرانیەکان. من نازانم گەر هیچ بنچینەیەك (اساس) هەبێ بۆ ئەمانە، بەلام قەشەیەکی نەستۆری کە لە روسیا گەراوەتەوە، رایگەیاندوە کە لەشکریکی گەورە لە یەریڤان کۆبۆتەوە.

(ئیمزا) ئیمیلیەس کلایتن

## ژمارە: ٥٥

### لە کۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وە بۆ ئیرل گرانڤیل (لە ٤ی کانونی یەکەمدا گەیشتوە)

گەورەم، تەوریز، ١١ ت٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کەهاوپیچ راپۆرتیك لەسەر وەزعی مەسیحیە نەستۆریەکانی ورمێ بۆ جەنابتان بنیرم کە لەئاکامی ئەو لیکۆلینانەوە هاتوە کە لەماوەی دوا سەردانم بۆ ئەو ناوچەیە، کردومەو، لەو باوەرەشدام کە شوینی رەزامەندی جەنابت بیت.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاو پیپچی ژمارە: ٥٥

**راپۆرتی کۆنسوڵی گشتی، ئابۆت لەسەر وەزعی مەسیحیە نەستۆریەکانی ورمێ**

بۆ ئەوەی بۆچونیکی راستو بیگەرد دەربارەی ئەو شوینەی نەستۆریەکانی تیا دانراوە پیکبهینن، پیدەچو ناچاربین بەوردی لە پەیوەندیەکانی نیوان کریچیە مەسیحیەکانو خاوەن مولکە موسلمانەکانیان بکۆلینەوە، هەروەها ئەو شیوازەی بەکار دەهینرا بۆ کۆکردنەوەی باجو خەراجو، بەراورد کردنیکیش لەنیوان حالەتی ئەو شتانەی کە هەردو رەگەزەکە بەدوای یەکدا تیایدا ئەژین.

دەشتی ورمێ، کە شارەکەی تیادایە بەو ناوەوە، نزیکەی ٥٠ میل بۆ باکورو باشور دریژ دەبیتەوە. لەلای رۆژهەلاتیەوە، دەریاچەیەکی خوییاوی هەیە، بەپانتایی ٣٠٠ کیلۆمەترو، نزیکەی ٥٠٠ گوند بەچری لەو ناوەدا بلاوبونەتەوەو، سەرو ١٠٠ گوند لەمانەش خەلکانی مەسیحی نەستۆرینو ئەوەش دەمینێ (باقیەکەی) موسولمانن. زۆرایەتی موسولمانەکان شیعەن، بەلام هەروەها ژمارەیەکی زۆری گوندی پرشو بلاو لەدەشتەکەدا هەن، کە کوردە سوننی مەزەبەکانیان تیادا نیشتەجیێیە.

ئەوسێ روبارە سەرەکیەی کە لە چیاکانەوە هەلدەقولین، ئاوی دەشتەکە دەدەنو خۆیان لەناو دەریاچەکەدا بەتالٌ دەکەنەوە ئەمانەن– چەهر چای، براندوز چایو، نەزلو چای. دەشتی ورمێ، ئەوەندە بە پیتو پر دارو درەختە، شایستەی ئەو ناوەیە "بەهەشتی ئیران" کە لە بەهاراندا پیێ دەلین.

خاوەن مولکەکان، وەیان گەورەی گوندەکان، بەشیوەیەکی سەرەکی ئیلی ئەفشارنو شیعە مەزەبن.

سیستمی باجو خەراج لەهەندێ گوندا بە "گورال" ناودەبرێ، کە واتا حەرفیەکەی "ببینەو وەربگرە"یە.

ئەو باجانەش کە بەپیی ئەمە دەسەندرێ بریتین لە: باجی خانوی موسولمانان، ٥ قران =؛

هەمان شت بۆ مەسیحیەکان، ٨ قرانە= ؛ باج لەسەر ئاژەلٌ، موسولمانو مەسیحیش وەکو یەك ئەیدەن، وەك لە خوارەوە هاتوە: گامیش، ٣ قران= ؛ مانگا، ١,١٠ قران؛ ماین، ٣ قران= ، مەر، ١٠ شاهی= ؛ گوێ دریژ، ١,١٠قران لەسەرو ئەمانەشەوە، هەمو ئەو مەسیحیانەی تەمەنیان لەسەرو ١٥ سالیەوەیە، باجیکی سەرانە (رای) لە بری خزمەتی سەربازی ئەدەن، کە سالانە ٥ قرانە=

نیشانە بەوەی سەرەوە، من تیناگەم لەسەر چ مەبدەئیکی یەکسانی دەبێ مەسیحیەکان ٣ قران لە موسولمانەکان زیاتر بدەن بۆ باجی خانو.

سەبارەت بەو پەیوەندیانەی کە لەنیوان کریچیو خاوەن مولکەکان، یەك بەدوای ئەویتردا هەیە، وا دیارە ئەوەی یەکەمیان، جا موسولمان یان مەسیحیەکان بن، هەمان سیستەم دەیانگریتەوە. خاوەن مولك بەرپرسیارە بەرامبەر حکومەت بۆ کۆکردنەوەی باجو خەراج، بەپارە بیت یان هەر جۆریك، کە بۆ هەر گوندیك دەقەبلیندریت؛ ئەو برە پارە دەستنیشانکراوەی کە سالأنە داوا دەکریت بچیتە سجلاتی حکومەتەوە. لەلایەکی تریشەوە، کریچیش بەرپرسیارە بەرامبەر خاوەن مولکەکە بۆ دانەوەی قەرزی ئەو باجەی لەسەریتی، ئەوەی کە کەسایەتی شەخسی خۆی بە تەواوی لەسەری بەندە، جا ئەگەر سیستمیك لە بنچینەدا عادل بیت، وە یان بگۆریت بۆ ئامرازیکی چەوساندنەوە.

ریك لەنزیك کۆلیجی ئەمریکاییەوە کەمن تیایدا دەژیام دو گوند هەبو- یەکیکی موسولمان، ئەویتریان هی مەسیحی- هەریەکەیان ١٥ مالی تیادا بو و، هەردوکیشیان هەمان خاوەن مولکیان هەبو. من وای بۆ دەچوم کە ئەو سیستەمەی لەم نمونەیەدا بەکار دەهینرا، پیوانیکی باش بوبیت لەوەی کە لە هەمو دەشتی ورمیدا پیرەو دەکرا. لە هەردو ئەم گوندانەدا، خاوەن مولکەکە تۆوی ئەدا بۆ چاندنی غەلەکە، کە (؟) بەشی لی وەردەگرتو کریچیەکەش یەك بەش. بەرهەمی سالأنە نزیکەی ٥٠ خەروار گەنم بو. حکومەت باجی تارادەی ٥ قران لە هەر خەرواریك وەردەگرت. بەو پییە، سەرجەمی باجەکان دەبوە ٢٥ تومان لە سالیکدا. گەر ژمارەی دانیشتوانەکە بە ٧٥ کەس دابنیین. هەر مالەو پینج کەس، ئەوا باجی سالأنە دەگاتە ٣ تومان بۆ هەر یەکیك، کە بەرامبەر دەوەستیت، کاتی دەمبینی موسولمانەکانو مەسیحیەکان سیستمیکی هاوشیوە دەیگرتنەوە، زۆر ئازارم دەچیشت بۆ لیکدانەوەی ئەوەی گەر موسولمانەکان بەشیوەیەکی تایبەتیو لەهەرچی رویەکەوە بی، لەسەر ئازارو زەرەری ئەوەکانی دواوە (مەسیحیەکان) (امتیازیان پی درابیت). ئاکامی لیکۆلینەوەکانم ئەوەبو کە چەندین نمونە دەرکەوتنەوە، کەخاوەن مولکە موسولمانەکە بەم ریگەیە ئەیدا بەلای هاو ئاینەکەیدا. لەبری ئەوەی بەشیوەیەکی بابەتی لەسەر بەندی ریکەوتنەکە بروات، سەبارەت بەدابەشکردنی تۆو، وەك لەسەرەوە باسکرا، هەندی جار ریگەی ئەدا بە کریچیە موسولمانەکان کە چەند دۆنمیکی کەم لە ئەرز بە تۆوی خۆیان بچینن و دو بەشیش لە غەلەکە تەرخان بکات، کەچی نەرمیی لەم شیوەیە هەرگیز پیشانی نەستۆریەکان کە یاسایان بەوپەری توندیەوە بەکار دەهینرا، نەئەدرا.

لەدەشتی ورمیدا، سەردانی چەند گوندیکم کرد، کە دانیشتوانی هەندیکیان تەنیا مەسیحی بون، ئەوانی تریش موسولمان. بەلای منەوە جوتیارە مەسیحیەکان

بەشیوەیەکی گشتی بوەو پۆشتەتر بون، بەڵام لەبەر ئەوەی بەزۆری کەمایەتی بون، کەمتر دەیانتوانی سەرکەوتوانە بەرامبەر خاوەن مولکە چەوسینەرەکەیان بوەستنەوە وەك هاوسێ موسولمانەکانیان.

کاتێ بیستم کە لە گوندی ئەردەشای کە مولکی دەولەتەو لەژێر سیستمی "گورال"دایە، باج و خەراج بە گۆترەترین (کیفی- اعتباطی-) شیواز دەسەپینرا، نارەزاییەکی دۆستانەم لای حاکمی ورمێ دەربری، کە دەستبەجێ گەورەی گوندەکەی بانگ کرد بۆ حساب کردن و، فەرمانی توندی دەرکرد بۆ ریگەگرتن لە دوبارەبونەوەی خراپەکاری لەو بابەتە.

لە گۆك تەپە، کە یەکیکە لە هەرە گوندە گەشەکردوەکانی ناو دەشتەکە، مامەوەو سەر لەبەیانی رۆژی یەك شەمە لە کلیسە نەستۆریەکەدا نویژم کرد. کۆمەلیکی گەورەی خەلکی نەستۆری، پیاوان، ژنان و، منالان لەهەمان نویژدا بەشدار بون. لەدوای نیوەرۆدا، لە کلیسەیەکی بچوکدا لە میسینورە ئەمریکیەکانی تایەفەی (مەزەبی) پریسبینزیان دروستیان کردوە، ئامادەی نویژیکی گشتی بوم. دوای هەردو نویژەکە، بەزمانی تورکی وتاریکم بۆ خەلکەکە خویندەوە، دلنیام کردن لەو بایەخە زۆرەی کە خاوەن شکۆ شاژن (ملکە) بە شەخسی داویەتی بەخیرو خۆشییان، وەك کەسانیکی مەسیحیو، لەکاتیکدا کە هانم ئەدان بۆ بەجێ هینانی ئەرکەکانیان وەك رەعیەتی شا، ئەوەشم بۆ رون کردنەوە کە بەهۆی ئەو دۆستایەتیەی کە لەنیوان ئیران و ئینگلستاندا هەیە، شای ئەو ولاتەی دواینە (ئینگلستان) بەم دواییانە بەشداری لە تەبەروعیکی سەخیدا کردوە بۆ بەهەناچونی ئەو نارەحەتیەی قاتوقریەکە هینابوی.

بەداخەوە دەلیم کە لە هەندێ گوندەکانی سەر روباری نازلو چای‌دا، خاوەن مولکەکان بەشیوەیەکی فراوان پەنایان دەبردە بەر کاری سوخرە بۆ کیلانی کیلگەی برنج و باخی رەزەکانیاندا. وەك من دەیزانم، ئەو کریکارانەی کە لەهەردو موسولمان و مەسیحیەکانەوە بە سوخرە دەبران هیچ موکافەئەیەکی مادیان نادریتێ بۆ کارەکەیان و بەدەگمەنیش گەر پاروە نانیکیان بدریتێ، ویرای ئەمانەش چەندین گازندەم پێ گەیشتوە کە زۆر جار لەلایەن سەرکارەکانیانەوە بەدلرەقیەوە لییان دراوە. پیدەچێ، مەسیحیەکان زۆرتر لە موسولمانەکان راپیچی ئیش بکرین و، چاکیش وایە کە سیستمەکە بە تەواوی نەهیلریت. سەرباری ئەو قاتوقریە دردۆنگەش کە ولاتەکەی لەناو بردوە، لەوە ناچیت حکومەت هیچ کام لە باجەکانی واز لیهینابیت. لەم روەوە، موسولمان و مەسیحیەکان، وەك یەك هەمان کارەساتیان توش بوە؛ بەلام بیگومان ئەوانەی یەکەم (موسولمانەکان) زۆرتر توشی قاتوقریەکە هاتون، چونکە هیچ ریکخراویکی خۆجییی لەناو کۆمەلگاکەیاندا نەبوە بۆ

بەهــەناچونی نارەحەتیەکەیانــەوە، کــەچی نەســتۆریەکانی کــە لەســـەر پیشـــنیاری میســـیونیرە ئەمریکاییـــەکان کاریـــان کـــردوە، کۆمیتـــەی فریاگوزەریـــان پیکـــهیناوە، تەنانەت پیش ئەوەیش کە سەرمایەیان لە ئینگلستان و ولایەتە یەکگرتوەکانەوە بۆ بنیردریت. بەم ریگەیە، ژمارەی گەورە لە مەسیحیەکان، لە برسیتی رزگاریان بو. یەك پارمەتی ئەویتری ئەدا تاوەکو سەرچاوەکانیان بە تەواوی نەئەما،؛ بەلاّم لە هەندیّ حالەتدا، دانیشتوانی ژمارەیەکی زۆر لە گوندە ئیرانیو کوردەکان، بە تەواوی لەناو چون و، لەهی تریشدا سەرجەمی دانیشتوانە نیرینەکان مردن و ژمارەیەك لە بیوەژن و منالیان بە تەواوی بیّ دەرەتان بەجیّ هیشت.

هەندیّ جار، ئەو سیستمی چەوساندنەوەیەی کە پەنای بۆ دەبرا بۆ کۆکردنەوەی باجو خەراج، لەکاتیکدا کە رو ئەدات گەورەی گوندەکە کابرایەکی بیّویژدان و، بۆگەنیی سەرچاوەکانی عەدالەت، خەلکانی فاسدو زەرەر بەخشن، کە شیوەیەکی گشتی لە محمدیانو موسولمان وەك یەك پیکدینن؛ لە ئەنجامی گرتن لایەنی نویژیکدا، مەسیحیەکان ناتوانن بەرهەمەکانیان بۆ فرۆشتن بهینن بۆ بازارو، موسولمانەکانیش رەفزی ئەوە دەکەن بیکرن؛ بەهۆی ئەوەی دانیشتوی شوینە پر پشیویەکانی سەر سنورن، کە دەسەلاّتیان لی زۆر لاوازەو، ئەو ناوچانەن کە خراپ بەریوە دەبرین، هاوولاّتیانی ورمیّو گشت دانیشتوانی دەشتەکەی دەوری، دەکەونە بەر (عرضه) پەلاماردانی بەردەوامی کوردەکانەوە، کەوا لە ژیان ومولك و مالّ دەکەن لە هەمو بەشیکی تری ئیمپراتۆریەکەدا نائەمین تر بیت. کاریکی ئەستەم بتوانریّ چارەسەریکی هەمیشەیی بۆ ئەم بارو دۆخە ناهەموارە دابنریت. بەتەنها کات، یاساکانی تارادەیەك گۆرانکاریە سیاسیەکان دەتوانن کار بۆ چارەسەریکی رادیکالاّنە بکەن.

بەلاّم جۆریکی تریش لەگازندە هەیە کە پیدەچیّ دان بە ریگە چارەیەکدا بنیتو، لەناو ئەمانەدا یاسای "جدید الاسلام" دینمەوە. لەروانگەی ئەم یاسایەوە، گەر ئەندامیکی خیزانیکی مەسیحی ببیتە موسولمان، ئەوا لە مولك و مالی ئەو خیزانەی بەردەکەویت و، وشەی خیزانیش تەنها باوك و دایك ناگریتەوە، بەلکو خزمە دورەکانیش. زۆر دەگمەنە مەسیحیەك بەم اغرایە لە دین وەرگەریّ، بەلاّم شتیکی نائاسایی نیە کە گەنجیکی موسولمانی سەرکیش کچە مەسیحیەکی خیزانیکی بوەو دەولەمەند تەفرە بدات، یان بەزۆر بیفرینیّ، بۆ ئەوەی بلاّوی بکاتەوە کە بۆتە موسولمان و، داوای مولك و مالی خیزانەکەی بکات.

ئەگەر کچەکە دەستبەرداری ئاینەکەی نەبیّ، ئەوا تەواو شتیکی ئاسانە کە کچیکی تر بهینیت بۆ ئەوەی دەوری ئەوی (مەسیحیەکە) بۆ ببینیت؛ دەتوانریّ تەنها

له دادگادا بەپەچەوە پیشان بدریت. چەندین حالەت رویداوە، کە بەم ریگەیە مولك و مالی چەندین خیزان زەوت کراوە.

لابردنی ئەم یاسا ناقۆلایە، کە ئیهانەیەکە بۆ ئیمانە گشتیەکەمان، هاندەریکە یارمەتی تاوان ئەدات، پیشیلی هەمو مەبدەئیکی عەدالەت (دادوەری)، ئاین و مرۆڤ دەکات، هاندەرو ئاگادارکەرەوە دەبیت بۆ حکومەتی ئیران لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەردەوامبونی زیاتری، سەلبی ترین انطباع لەئەوروپادا دروست دەکات و، چاکتر بۆ ئیران لەوەدایە ئەو یاسا خراپە پر شەرمەزاریە لەرەگەوە دەربهینیٚ، پیش ئەوەی فشاری دەرەوەی بخریتە سەر بۆ لابردنیو گەر بە انصافەوە بروانینە حکومەتی ئیرانی، لەو باوەرەدام کە شتیکی راستە ئەوەش بلیم کە کاتیك حالەتی فراندنی بەزۆر دەهینریتە بەردەمیان، ئامادەن بۆ ریگە چارەیەك بۆی. ئەو لایەنانەی کە ریگە لەرەوتی عەدالەت دەگرن فەرمانبەری ئیرانی نین، بەلکو قەشە ئیرانیەکانن. من لەم جۆرە، دو حالەتم هەبوە کە لە دو سالی رابوردودا مامەلەم لەگەڵ کردون. لە هەردو حالەتەکەدا، کچەکە گیردراوەتەوە بۆلای دایك و باوکیو تاوانکارەکەش سزا دراوە. دوا حالەت چەند مانگیکی کەم لەوەبەر رویداو، هیشتا هەروا مابۆوە کاتیٚ تەوریزم جیٚهیشت و رۆیشتم بۆ ورمیٚ. بە گەیشتنم بۆ ئەویٚ، زانیم کە تاوانکارەکە، لە ئەنجامی گازندەکانی وەزیری مفوض حکومەتی خاوەن شکۆو خۆمدا بە زیندانکردنی ٣ حەفتەو غەرامەیەکی قورس لە تاوانەکانی پەشیمان بۆتەوە. بۆ ئەوەی سزاکە تەواوتر بیت، لەسەر داوای من، حاکمی ورمیٚ گەرەنتیەکی نوسراوی لەتاوانکارەکە سەندو، لەژیر سزای توندا بەستیەوە تا لەداهاتودا بە رەوشتی جوانەوە رەفتار بکات.

لەم ولاتەدا، شایەتی مەسیحیەك دژی موسولمانیك لەدادگایەکی دادوەریدا وەرناگیریت وەك لە تورکیادا هەیە؛ بەلام هەرچۆنیك بیت، تورکیا لەبنەرەتدا لەریگەی بانگهیشتنی ئیمپراتۆری هەمە جۆرەوە دانی بەوەدا ناوە کە لەم روەوە هیچ جیاوازیەك نیە لەنیوان دو رەگەزەکەداو؛ بەوپییەش، هیزە ئەوروپاییەکان بناغەی قایمیان هەیە کە کاری لەسەر بکەنو بەوهۆیەوە بۆیان هەیە وەك مافیك داوای رزگارکردنی تەواوی ئاینییو سیڤیلی هەمو دانیشتوانە مەسیحیەکانی ژیر دەسەلاتی سولتان بکەن. لەم روەوە، لەوانەیە چاکتر وابیٚ کە بیر لەوە بکریتەوە هیچ دەستپیشخەریەك (مبادرە) لە ئیراندا نەکریت، بە پیشاندانی خواستیان بۆ حکومەتی شا، بۆ دەرکردنی فرمان بۆ مەسیحیو جولەکەکان کە لە ریگەیەوە هەمان ئەو وەزعو ئیمتیازەیان پیٚ بدریت کە رەگەزی دەسەلاتدار هەیەتی. من باوەر ناکەم کە ئەو فەرمانانە لەهەمو کاتیکدا بەوردی جیبەجی بکریت، بەلام دەنگی ئینگلستان کیشیکی قورستری دەبیت کاتیك بەراشکاوی وەك مافیك داوای وەستاندنی ئەو

خراپەکاریانە دەکەین کە لەم کاتەدا دەتوانین تەنها ئاگاداری دۆستانە وەیان نارەزایی معتدل بە نەبرەیەکی لاواز دەرببرین.

هەروەك ئیستا باسم کرد، نەستۆریەکان باجیکی تایبەتی دەدەن، کە لەخزمەتی سەربازی دەیان بویری (اعفاء)؛ بەلام لەم دواییانەدا، دەسەلاتدارەکان دەستیان کردوە بەوەی کە زۆریان لیبکەن وەك مۆسیقاژەن لە تیمە سەربازیەکاندا خزمەت بکەن. ئەمان بەرقەوە (کراهیە) لەم سیستمە دەروانن، چونکە لە سەربازیدا لەنزیك موسولمانەکانەوە دایاندەنێو، دەبیتە هۆی ئەوەی ئەوانیش بەدلرەقیو کەم ریزەوە رەفتاریان لەگەڵ بکەنو، خوازیار دەبن کە لەم روەوە تەواو ببوردرین.

نەریتیکی نەستۆریەکان ئەوەیە کە هەمو سالیك بەژمارەی زۆر سەردانی روسیا دەکەن. هەندیکیان لە تفلیس یان لە شوینەکانی تری قەفقاس وەك کریکاری رۆژانەو ئیشی دەست کاریان چنگ دەکەویت؛ هی تر، خۆیان لە سوالکردندا دەبیننەوەو بۆ ئەو مەبەستەش دەچنە مۆسکۆو پیتەرسبورگ. لەوانەیە، لەدنیادا هیچ رەگەزیك نەبیت وەك ئەمان ئەوەندە وابەستە بن بە سوالکردنەوەو، واش دەردەکەویت کە لەم روەوە کاریکی گەشە کردویان هەبێ. حساب کراوە، سالانە ٥,٠٠٠ نەستۆری سەردانیروسیا دەکەن، لەوانە ٣٠٠ بۆ ٥٠٠ کەسیان بۆ مەبەستی سوالکردنو ئەویشی ماوە، بۆ گەران بەدوای کاردا دەچن؛ داهاتی سالانە لەو سەرچاوەیەی پیشوەوە ریژەی ٤,٠٠٠ لیرەو، ئەوەی دوایشەوە ١٠٠,٠٠٠ لیرە پیشان ئەدات.

بەهەرحاڵ، نەستۆریەکان، لەگەرانەوەیاندا لە سەفەرەکەیان، بەشیکی زۆر لە دەستکەوتەکانیان لە خاکی ئیراندا لێ دەسەندن. کاربەدەستەکانی سەر سنوری ئیران، کوردەکان، پاسەوانەکانی حکومەت ئەوانەی بەروالەت بۆ گرتنی دزو جەردە دانراون، بەلام پەنا دەبەنە بەر کاری نایاسایی بۆ پەیداکردنی نان– لەم دواییانەدا ئەم خەلکە بەدبەختانەیان بەبێ بەزەییترین شیواز روت کردۆتەوە بەلام لەروی دادوەریەوە سەبارەت بەکاربەدەستە ئازەربایجانیەکان، پیویستە ئەوە بلیم کە بەشیوەیەکی نەگۆر ئامادەن ئەم زولمو زەرەرانە ببژیرن کە رەعیەتەکانیان داویانە، لەهەر شوینیك گازندە لەسەر مەسەلەکە دەکرێو، وەلیعە هەدی پایە پلندیش توندترین ئیجرائاتی کردوە بۆ ریگەگرتن لە رودانەوەی ئەو جۆرە کارانە. بەتەنها سالی پار، لەسەر پیشاندانی حالەتیکی در دونگی لەم جۆرە، ئەو فەرمانبەرەی لە کارخستبو کە بەشیوەیەکی سەرەکی بەرپرسیاربو، وە هەموو کەلوپەلی نەستۆریەکانی بۆ گیرابونەوە کە لەدەستیان دابو.

هەرچەندە لەوەی سەرەوەدا دەبینریت کە دۆخی مەسیحیەکان خواستی زۆر جێ دیلیت بۆ جیبەجێکردنیان، بەلام گومان لەوەدانیە کە لەو سالانەی دواییدا

بەجۆریکی لەبەرچاو چاك بوە. لەم بۆچونەمدا، هەردو میسیونیرە ئەمریکیەکان‌و نەستوریەکان خۆشیان پشتیوانیم لی دەکەن. فەرمانبەرە ئیرانیەکان وەك دەسەلات، زۆر لیبوردون (متسامح)و، هەرگیز تەنگ بە مەسیحیەکان هەلناچنن لەپەیرەو کردنی ئەرکە ئاینیەکانیاندا. ئەو نفوزەی کە میسیونیرە ئەمریکاییەکان بەراستی (بحق) لەناو ولاتەکەدا بەدەستیان هیناوەو، ئیستا بۆ چل سال دەچیت لە ناو نەستۆریەکاندا کار دەکەن، پاراستنی کافییان بۆ مسۆگەر دەکات لەحالەتی زولمی ئاساییدا (عادی– بسیط). کاتیکیش حالەتی جدی روئەدات، میسیونیرەکان راپۆرت ئەدەن بە من‌و، منیش هەمیشە کاربەدەستە ئیرانیەکانم بینیوە ئامادەن بۆ بژاردن. لەمەسەلەی گیروگرفتی تایبەتیدا، هانا دەبەم بۆ یارمەتی وەزیری مفوض حکومەتی خاوەن شکۆ لەتاران‌و، بەهۆی ئەم ریگایانەوە هەمیشە سەرکەوتو بوم لە وەدەستهینانی ئامانجی خوازراودا.

هەمو سالیك، ئەو ورەو چاکبونە ماددیەی زیاتر لەنیو نەستۆریەکانی ورمیٚدا لەبەر چاوە، بەزۆری بەهۆی هەولو تەقەللای میسیونیرە ئەمریکاییەکانەوەیە. لەناو هەمو گوندیکی نەستوریدا، مسیونیرەکان شوینیکیان بۆ عبادەت‌و قوتابخانەیەك بە قەشەو مامۆستاکەیەوە هەیە. خانوەکانی مسیونەکە لەدەرەوەی شارن، کۆلیجیك، خەستەخانەیەك‌و، مالی جیٚنشینیان تیدایەو، لە ١٥ دۆنم زەویدان؛ ئەمانە هەموی بینای زۆری جوان‌و، شایەتی راوەستاوی لیبوردویی حکومەتی ئیرانن. نەستۆریەکان ئەم نەوە پیاکەوتوە خویندنیکی چاك‌و راستیان هەیە، هەم ئایینی‌و هەم دنیایی (علمانی)و، فیری خویندنەوەو قسەپیکردنی زمانی ئەنگلوساکونیش دەبن. مەسیحیەت، بەبلاوکردنەوەی عبادەی خۆی لەهەمو شوینیکی ئەم ناوچانەدا، باشترین ضمانەت وەدەست دینیت بۆ پیشەوەچون لەداهاتوداو، هیدی هیدیش بانگەوازی نزیکبونەوەی (یبشر– یعلن) سەردەمیکی روناکی‌و ئاشتی دەکات.

(ئیمزا) ولیام جی ئابۆت تەوریز، ١١ ت٢، ١٨٨٠

## ژمارە: ٥٦

له کۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٤کانونی یەکەمدا گەیشتوە)

گەورەم، تەوریز، ١٥ی ت٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپیچ هەلبژاردەی یادەوەری رۆژانەکانم کە لەورمیٚ دامنابو لەکاتی هوروژمی کوردەکاندا، لەگەل کۆپی ئەو نامەیەم کە بۆ وەزیری مفوض حکومەتی خاوەن شکۆ لەتاران دەربارەی هەمان مەسەلە ناردبوم، بۆ جەنابتان بنیرم،

هەروەها باسیکی ئەو گەشتەم بکەم کە بۆ ناو مەرگەوەر، شنۆ، سولدوزو، سابلاخدا کردوومە بۆ بارگەی ئیرانیەکان لە بناب.

بە بیستنی هەوالەکانی پر لەترسی هاتنە پیشەوەی لەشکری کوردەکان بەرەو تەورێز، بەئەرکی خۆمم زانی ورمێ جیهیلمو، ئەوەندەی بتوانرێ بێ دواکەوتن بگەریمەوە بۆ شوینەکەی (پۆستەکەی) خۆم. خەتەریکی زۆرم دەهاتە رێ گەر هەولمبدایە بەریگائاساییەکەی سەلماس‌دا وەرگەرامایە، چونکە شیخ سادق لەوەدا بو پەلاماری هیزەکەی ئیران بە فەرماندەی تەیمور خان لەو نزیکانەوە بدات. تەنها ریگەی کراوە بۆ من ئەوەبو کە پشت ببەستم بە یاوەریکی کوردەوە کە شیخ دابومێو ریگەی خۆم بگرم بەناو ئەو ریزە ئاواییانەی تەسلیم بە سوپاکەی ببون. تەنانەت ئەو ریگەیەش کە من هەلمبژاردبو، مەترسی زۆری تیدابو و، ئەو کاتە ئاهیکم پیداهاتەوە کە لەکۆتاییدا چومە ناو بارگەی ئیرانیەکانەوە.

لەبەر ئەوەی شیخ پیی راگەیاندبوم، کە یاوەرەکە لەبارەگای کوردەکان (حرس-مرافق) چاوەروانم دەکات، ناچار بوم بچم بۆ ئەوێو، بینیم ئامادەیە بۆ ئەوەی لەگەلمدا بروات.

لەماوەی مانەوەمدا لەورمێ، وام پێ راست بو کە هەمو قورسایی نفوزم بخەمە سەر شیخ، هەم بۆ ئەوەی خوینی ناپیویست نەرژینرێو، هەم بۆ مسۆگەرکردنی سەلامەتی شەرنەکەرەکان.

بیگومان تالانکردنی گوندەکانی مەسیحیو موسولمانەکان لە دەشتی ورمێ لەلایەن سەربازە کوردەکانەوە شتیکی لەدەست بەدەرنیەو؛ ترسی ئەوەشم هەیە کە بونی سوپایەکی گەورەی زیادەی ئیرانیەکان لە ناوچەکەدا، بارودۆخەکە لەم روەوە زیاتر ئالۆز بکات.

کاتێ لە ورمێ بومو لە گەرانەوەشمدا لە گەشتەکەم، زۆر کەوتومەتە شوینی خەتەرەوە، بەلام باوەرم وایە کە ئەو هەولانەی من داومە بۆ رزگارکردنی ژیانو مالی بەدبەخترین خەلکانی مەسیحیو موسولمانان دەبیتە شوینی رەزامەندی حکومەتی خاوەن شکۆ.

(ئیمزا) ولیام، جی ئابۆت

## هاوپیچی ١ی ژمارە:٥٦

هەلبژاردە لەیادوەری رۆژانەی کۆنسۆلی گشتی ئابۆت کە لەورمێ نوسیویتی لەماوەی هوروژمی کوردەکاندا.

**لە گەرانـەوەمدا وەك جیگـری حـاکم لـەدوای نیـوەرۆی ٢٠ی تشـرینی یەکـەمدا، دکتـۆر کۆچـران م بینـی نامەیـەکی لەشیخ عوبەیدوالـلـەوە پیگەیشـتبو، دەلیـت ئـەو شەوە لـەچیای سیر دەبیت، میسیونیرەکانیش دلنیا دەکات کە ئەو ریز لـە کۆمەلـە ئـەوروپیو مەسیحیەکان دەگریـتو، ئامۆژگاریـان دەکات کـە چەندیك دەتوانـن هـەمو خـەلکو کەسـەکانیان پیکـەوە لەشـوینیکی ئـەمیندا کۆبکەنـەوە. هـەرزوو بیناکـانی کۆلیجەکە، پـر بو لـە ژمارەیـەکی زۆر لـە نەستۆری؛ پیاوان، ژنان لەگـەلّ منالاّندا کـە پەنایان بۆ ئەویّ بردبو.**

**٢١ی تشرینی یەك- شیخ دو نیردراوی لە ورمیّوە نارد، داوا لە خەلکەکە دەکات تەسلیم بنو، تانیوەرۆ مۆلەتی داونەتیّ کە بیری لیبکەنەوە. دکتۆر کۆچرانو مستەر لابارین رۆیشتن بۆ مار سورعینس بۆ دیداری شیخ.**

**٢٢ی تشرینی یەك- ئەم بەیانیە، بەسواری لەگـەلّ دکتـۆر کۆچـراندا چوینـە نـاو شـارەوەو، دیداریکمـان لەگـەلّ ئیقبـال الدولـەدا کـرد. حـاکم گوتـی، ئـەو لەگـەلّ ستافەکەیدا بریاریـان داوە بـەرەنگاری بکـەن، بـەلاّم هاولاّتیـان چیـان پـیّ خۆشـە بـا وا بکەن. ئامۆژگاری ئیقبال الدولەم کرد کە لـە دەرەوەی دیوارەکـانی ورمـیّ شـەر بکات، بۆ ئەوەی شارەکە لە تالاّنیو کوشتنو برین دور بیت، مەلا گـەورەکان (سـەرەکیەکان) ناردیانە لای شیخو بەناوی خۆیانو شارەکەیانەوە مل دانەواندنیان پیشاندا. ئیقبـال الدولە وەك خزمەتیك داوای لیکردم هەولی دیداریك لەگەلّ شیخدا بدەم بۆ ئەوەی وای لیبکەم جەنگەکەی راگریتو، لەهـەمان کاتیشدا پـەیوەندی بە پایتـەختو تـەوریزەوە دەکات. ئەگـەر شیخ واز لـەنیازی پـەلاماردانی ورمـیّ بهینیت، وا ئیقبـال الدولـە رازی دەبیت شـەر راگریت، بـەلاّم گـەر شیخ سوربیت لەسـەر شـەر، ئیقبـال الدولـە پیشـنیار دەکات کە بۆ ئەو مەبەستە بچنە دەرەوەی شار.**

**لەگەرانەوەمدا بۆ کۆلیجەکە، بیستم شیخ لەگەلّ سوپاکەیدا بەریوەیە بۆ شـارەکە. لەبەر ئەوە تیبینیـەکم بۆ ئیقبال الدولـە نوسی بۆ ئەوەی لەمە ئاگادار بیت. پاشـان لەگەلّ دکتۆر کۆچرانو مستەر شیردا روەو بارەگاکەی شیخ رۆیشتین. دەستبەجیّ بە شیخو سوپاکەی گەیشـتین، رووەو ورمـیّ دەکشـان. شـیخ زۆر خـۆش مەعشـەر بـو. داوای بە تەنگەوەهاتنی دانیشتوانە مەسیحیو هـەموو خەلکـە شـەر نەکـەرەکانم لای شیخ کـرد، ئـەویش بـەلینیدا کـە هـەرچی لـە توانـایدا بـیّ بیکـا بۆ پاراسـتنی ژیـان و مالیان. ئینجا پەیامەکەی ئیقبال الدولەم دایە. شیخ گوتی، ئیستا کـاتی ئـەوە بەسـەر چوە کە بکەوینە وتو ویژ کردنەوەو، زۆریش گازندەی لە حکومەتی ئیرانی کرد. پیم راگەیاند کە من پیویستە بچمـە هـەر باسیکەوە سـەبارەت بـەو شـەرەی لـەنیوان ئـەو و ئـیراندا سـەری هـەلداوە؛ وە ئـەوەی کـە حکومـەتی خـاوەن شـکۆ ئاشـتیو ئـارامی**

دەخوازیت لەنیو سنورەکانی تورکیا– ئیراندا؛ وە لە دلەوە خیرو خۆشی دانیشتوانی ئەو ناوچانەم دەویٚ بەبیٚ گویدانە رەگەز یان باوەر. دوای ئەوە مۆلەتم وەرگرتو رۆیشتم.

لە ٢٣ی تشرینی یەکەمدا شیخ پەیامیکی تایبەتی لەکاتژمیری ٨ سەر لەبەیانیدا بۆ ناردم، نیازی خۆی دەردەخست بۆ پەلاماردانی شارەکە لەدوای نیوەرۆدا. شیخ گوتی، حەز دەکەم هەمو خەلکانی شەر نەکەر، جا هاوولاتی بن یا بیگانە، فرسەتیکیان هەبیٚو پیشەکی شارەکە جیهیلن، مەبەستیشی ریگەگرتن بو لە رشتنی ناپیویستی خوین. بۆ ئەوە، داوای لی کردم کە لەگەلٚ سیمون ئاغا کە لای خۆی کاری دەکرد بچمە ناو شارەکەو کاری جیهیشتنی خەلکە شەرنەکەرەکە لەشارەکە لەگەلٚ ئیقبال الدولەدا ریك بخەم. ئەم پیشنیارەم قوبولٚ کردو، کاتژمیری ٩ی سەر لەبەیانیدا، لەگەلٚ دکتۆر کۆچران، سیمون ئاغاو دو پاسەوانە ئیرانیەکاندا کەوتینەریٚ بۆ ئەوەی کەئیمە بیرمان لیدەکردەوە، کاریکی بەزەییانە بیت، روەو دەروازەی سەرەکی شارەکە. بە گەیشتنمان بۆ ماوەی ٢٠٠ یاردەیەك بۆ دەروازەکە، پاسەوانیکم نارد بۆ گەیاندنی مەبەستی میسیونەکەمان، بەلاٚم هەر ئەو ساتە، ئیرانیەکانمان بینی کەوتنە تەقەکردن لیی. لە راستیدا، لەچەند چرکەیەکی کەمدا، هەمومان کەوتینە بەرگوللەو لەنیو دەستریژی فیشەکی تفەنگدا بوین، کە بە خەستی لەهەمو لایەکمانەوە بەر دەبۆوە. ئینجا، خۆمۆمو هاوەلەکانم پاشەکشییەکی خیرامان کرد بۆ کۆلیجەکەو، بەزیندو مانەوەی منیش دەگەریتەوە بۆ خیرا دەرچونی ئەسپەکەم.

پاش نیوەرۆی هەمان رۆژ، سیمون ئاغا نامەیەکی لە شیخ وە بۆ هینام، تیایدا پاش بەکورتی باسکردنی ئەو روداوانەی سەرەوە، داوام لیدەکات نامەیەکی ئاراستە بکەم، تا بتوانیٚ لە داهاتودا بیخاتە بەردەست بۆ سەلماندنی پەرۆشی خۆی بۆ ئەوەی رەوشی ئەو شالاٚوەی ئیستا بگەیەنیتە بیرو بۆچونی مرۆڤایەتیەوە.

من رەفزم کرد کە دۆکیومینتیکی لەو جۆرە بدەم بە شیخ، بەلاٚم نامەیەکی کورتو بەوریاییەوەم ئاراستە کردو، دوای ئەوەی گەیشتنی ئەو نامەیەم پیٚ راگەیاند کەبۆی نوسیبوم، خۆم لەوەدا هیشتەوە کە بلیم، دەبیت لەوە دلنیا بیت کە بە دلسۆزیەوە راپۆرتی تەواوی وردەکاریەکانی ئەم جەنگەی ئیستا بۆ حکومەتی خاوەن شکۆ دەنیرم.

٢٧ی تشرینی یەك– نامەیەکم لە شیخەوە پیگەیشت، پیم رادەگەیەنیت کە وەفدیکی هاوولاٚتیانو مەلاکانی ورمیٚ دین بۆ باخچەکەی سیاوش، نزیك بارەگاکەی ئەو، پیکەوە لەگەلٚ ئەندامانی کۆمەلە بیگانەکاندا بۆ بەستنی کۆبونەوەیەك سەبارەت

بە تەسلیم بونی شارەکە. شیخ داوای لە منو میسیونیرە ئەمریکاییەکان کردوە کە ئامادەی ئەم کۆبونەوەیە ببین.

لە چەند دەقیقەیەکی کەمدا، خەلیفە سەعید موحەمد (زاواکەی شیخ)، چەند ئەفسەریکی کورد، لەگەڵ مەترانی نۆچیە هاتن بۆ کۆلیجەکەو وتیان هاووڵاتیانو مەلاکان پیشنیاری ئەو ریکخستنەی سەرەوەیان کردوە، کە ئیقبال الدولە سوپاکەی خۆی دەکیشیتە دەرەوەی دیوارەکانو، کۆبونەوەکەش دانراوە بۆ کاتژمیری ٢ی پاش نیوەرۆ. ئیمە تا ٣ی پاش نیوەرۆ چاوەروانمان کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی وەفدەکە لەشار نەهاتبوە دەر، پەیامنیرەکەی شیخ رۆیشتەوە بۆ بارەگای کوردەکان.

لەم دیدارەدا، خەلیفە سەعید محمد بۆی رونکردمەوە کە شیخ چیتر ئیبتزازی حکومەتی ئیرانی لە تەحەمولدا نەماوە، بەوەی کە هیچ شتیکی نەکردوە بۆ راگرتنی تالانی بەردەوامی خیلەکانی هەرکیو شکاکو بەشیوەیەکی خراپو توندوتیژ مامەلەی لەگەڵ کوردەکاندا کردوەو، لەریگەی رەوشی دامرکەرینەرانەی کۆنە شازادە حاکمی ورمیوە، گورزیکی توندی وەشاندوە لەسەربەخۆیی کوردستانو، ولایەتیکی جیای لی پیکهیناوە. شیخ ئەوە دەگریتە ئەستۆی خۆی کە دزو جەردەی خیلە هەمە جۆرەکان کە ببونە درکیکی هەمیشەیی لە کەلەکەی (جنب) تورکیاو ئیراندا سەرکوت بکات، چونکە ئەو دو زلهیزە نەیانئەتوانی بیانگرن، نیزام لە هەردو بەشی سنورەکەدا بگیریتەوە، مەسیحیو موسولمانەکان لەسەر ئەساسیکی یەکسانی دابنی، پشتگیری لە خویندن بکاتو، ریگەی دروستکردنی کلیسەو قوتابخانە بدات. هەمو ئەوەی کەشیخ دەیویست، پشتیوانی مەعنەوی زلهیزە ئەوروپاییەکان بو، بە تایبەتی ئینگلستان، کە ریزو سۆزیکی (مودە) زۆری بۆ هەبو. شیخ داوای دەکرد دادگایی بکریت. ئەگەر نەتوانی کوردستان ریك بخاتو، حکومەتیکی سەقامگیر پیکبهینیت، ئەو کاتە ئامادەیە لەلایەن مەحکەمەیەکی ئەوروپاییەوە دادگایی بکریت، وە ئاکامەکانیشی بگریتە ئەستۆ.

وەڵامی خەلیفەم دایەوە، بەوەی کە من لە مەرکەزیکی وادا نیم کە بلیم ئینگلستان یان زلهیزەکانی تر لە چ رۆشناییەکەوە دەروانن‌ە پرۆژەکەی شیخ. بەڵام، توانیم دلنیای بکەم کە، حکومەتی خاوەن شکۆ بەهیچ جۆریك پەیوەندی نیە بەو تەنگوچەلەمەیەی لەنیوان شیخو ئیراندا سەری هەلداوە، کە مەسەلەیەك بو پیویست بو مشتو مری لەسەر نەکەم، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، ئینگلستان زۆر پەرۆش بو بۆ ئەوەی ئاسایشو ئارامی لەهەردو سنورەکەدا بپاریزریت، بەشیوەیەك مەسیحیو موسولمانەکان سەربەستی تەواوی ئاینیو سیڤیل یان هەبیتو، لەم ململانییەی ئیستاشدا ژیانو مالی هەمو شەرنەکەران بپاریزن. بەڵام لەلایەکی ترەوە، بۆ من وا

دەرنەئەکەوت کە ئەو روداوە پڕ پەژارانەی کە لە میاندواو سەری هەلدابو سەرەتایەکی گونجاو بیت بۆ چەسپاندنی ئەو نیزامە کە شیخ پەرۆشی بۆ دەربریبو دایمەزرینێ. هەوالی کۆمەڵ کوژیەکەی میاندواو لەرزیتیکی پڕ ئەندیشە بۆهەمو ئەوروپا دەنیریتو، بەپەژارەو نارەزاییەکی زۆرەوە لەلایەن حکومەتی خاوەن شکۆوە وەردەگیریت. بەهەرحاڵ، من لەو باوەرەدا بوم کە لەوانەیە ریگەیەك بۆ گفتوگۆ لەنیوان حکومەتی ئیرانو شیخدا لەسەر بنچینەی دادوەری (عدالەت) بۆ هەردولا، بکریتەوە.

خەلیفە، پیش ئەوەی بروات، گوتی شیخ عوبەیدوالله ئامادە بوە کە یاوەریك بۆ من تەرخان بکات، بۆ ئەوەی لە گەلما بیت لە مەرگەوەر، شنۆو، سولدوزەوە بۆ سابلاخ، کە ئیستا بارەگای عەبدوالقادری کوریتیو، ئەمیش (عەبدوالقادر) بە سەلامەتی دەمگەیەنیتە مەسافەیەکی نزیکی بارەگەکانی ئیرانی.

لە ٢٨ی تشرینی یەکدا، بەرەو بارەگای کوردەکان کەوتمە رێ، لەوێ دیداریکم لەگەڵ شیخدا کردو، نامەیەکی بۆ عەبدوالقادری کوری دامێ. پاشان گەشتەکەم لەگەڵ یاوەرە کوردەکەمدا دەست پیکرد.

## هاوپیچی ٢ی ژمارە: ٥٦

### لە ئابۆت ی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆ مستەر تۆمسن

بەریز، تەوریز، ٧ی تشرینی دوەم، ١٨٨٠.

نیشانە بەو نامەیەم کە لە ٧ی مانگدا لە ورمێوە ئاراستەی بەریزتانم کرد، ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە راپۆرتی زیاتر بگەیەنم بەوەی کە، لە ١٦ی ت١دا ئیقبال الدولە کامپەکەی گواستۆتەوە بۆ بادیلبو، بۆ ئەوەی چاودیری جموجولەکانی هیزیکی گەورەی کوردەکان کە لە سۆمای برادۆست دامەزراون، بکات. پاش ئەوە، کوردەکان قەلای سمایل ئاغا کە کەوتۆتە نیوان برادۆستو دەشتی ورمێوە، داگیر کرد. ئیرانیەکان، لەهەولیکی ناسەرکەوتویاندا بۆ دەرپەراندنیان لەو شوینە، دو تۆپیان لەدەستدا.

لە ٢٠ی تشرینی یەکدا، شیخ کە لە نۆچیەو مەرگەوەرەوە دەهاتەوە، بارەگایەکی بەسوپایەکی گەورەوە لەسەر چیای سیر لیدا. هیزەکەیو ئەوەکەی سادقی کوری کە شوینی خۆی لە حەیدەرلو گرتبو، وەك باسدەکرا ٨.٠٠٠ کەس بون.

رۆژی دواتر، شیخ دو نیردراوی بۆ ورمێ ناردو داوای تەسلیم بونی شارەکەی کرد. ئیقبال الدولە، کە لە بادیلبو گەرابۆوە، بریاری بەرگریکردنی داو، خۆی بەسێ فەوجەوە لەنیو دیوارەکاندا قایم کرد.

هێرشەکە لە ٢٢ی تشرینی یەکدا دەستی پێکرد، دوژمن لەهەمو لایەکەوە گەمارۆی شارەکەی دابو، بەڵام تا ٢٨ی مانگیش هیچ شتێکی ئەوتۆیان نەکرد بۆ سەر دیوارەکان، کوردەکان تەنها یەك جار تا ناو دەروازەکەی چەرباش هاتن، بەڵام بەزیانەوە پاشەکشێیان پێکرا.

لەهەمان کاتدا، دانیشتوانەکە ویستیان تەسلیم بن، بەڵام ئیقبال الدولە بڕیاریدا کە بەرگری لەشارەکە بکات.

هەلێکم بە دەست هێنا بۆ بەهاناچونی دانیشتوانە مەسیحیو خەلکە شەرنەکەرەکانەوە لای شێخ کە بەڵینیدا ڕێز لەژیانو مالیان بگرێت، بەڵام چەندین گوندی دەشتی ورمێ تالانکرا، کە لەوە دەچو شێخ دەسەڵاتی نەبێ سەرکوتیان کات.

لە ٢٨ی ت١دا وە بەپاسەوانی کوردەکان کە شێخ بۆی دانابوم، ورمێم جێهێشتو، بەمەرگەوەر، شنۆ، سولدوزو سابڵاخدا ڕۆیشتم بۆ تەوریز. شێخ دڵنیای کردم کە نائەمین دەبێ گەر بەرێگای سەلماسدا بڕۆم، چونکە سادقی کوری خەریك بو لەو قۆڵەوە هێرش بکاتە سەر لەشکرەکەی تەیمور پاشا خان.

کاتێ ورمێم جێهێشت، شێخ بە ٦,٠٠٠ کەسەوە بارگەی لەخوار چیای سیر لێدابو. نامەیەکی دامێ بۆ کورەکەی، کە زۆر بەرێزو لوتفەوە پێشوازی لێکردم.

لەشکری کوردەکان لە سابڵاخ لە ١,٥٠٠ کەس زیاتر نەبون، چونکە زۆرایەتی خێلەکان ڕۆیشتبونەوە بۆ مالەکانیان بەو تالانیەی لەدەشتی میاندواو دەستیان کەوتبو.

ناوچەکەی نێوان ڕوبارو تاتاو و یاغیتو کە من پێیدا تێپەربوم، بە تەواوی لەلایەن کوردەکانەوە کاولکراوە سەرو ٢,٠٠٠ گوند سوتێنراوەو، ١٠,٠٠٠ کەسیش بێ لانەن.

لێکمداوەتەوە، ئەوەندەی ٢,٠٠٠ ئێرانیەك لە میاندواو کۆمەل کوژ کرابونو، لەنێو قوربانیەکاندا ژنو منالیان تێدابو. هەروەها لاشەی ٣٠ ئەرمەنیو ٥٠ جولەکە لە وێ بینرابو. لەلایەکی تریشەوە، ٩٠ ئەرمەنی کە توانیبویان دەرباز‌ببن لە گوندی تاجرباشیەکانی ڕوس، نزیك سابڵاخ سەرپەرشتی دەکران. لە ٣٣٠ لە دانیشتوانی جولەکە، تا ئیستا تەنها ١٣ کەسیان بەزیندوویی بینراونو، ژمارەیەکی زۆری ژنو منالی جولەکە لای کوردەکان بەدیل گیراون.

لەبەر ئەوەی بە تەواوی لەژێر ڕەحمەتی شێخ عەبدوالقادر بوم، ناچار بوم ڕازی بم بە هەر ڕێکخستنێك کە دەیکرد بۆ گەیاندنەوەم بۆ ناو خەتی ئێرانیەکان. پێی ڕاگەیاندم کە ٣٠٠ سوارەی کورد بەپاسەوانی دێن لەگەلم بۆ مەسافەیەکی نزیك بە کامپی ئێرانیەکانو، بەو جۆرە منیش لەگەڵ ئەو هێزە گەورەیەدا سابڵاخم جێهێشت.

هەمزاغای سەرخیلی مەنگور، عەبدواللە خان زەرزی، ئیبراهیم خانی برایو، زۆر سەرخیلی ناوداری تر لەگەڵ هیزەکەدا بون. بە گەیشتنمان بۆ چلیك، سەرخیلەکان لەپر شیوە مولەتیکیان لەمن وەرگرتو، سوارە کوردەکانم لەبەر چاو ونبو؛ بەلاَم بەهۆی ئەو دوکەلە چرەی کە دوای ئەوە لە هەموو لایەکی دەشتەکەوە بە دەرکەوت، ئاشکرا بو کە خەریکی ئاگربەردانی گوندەکانی ئەو نزیکانە بون.

بەسواری ولاَخەوە بەناو زۆر لەو گوندانەدا تیپەریم کە بە جزئی ویرانکرابونو، هەمو ئەو دانیشتوانەی مابون، کۆکردەوە، ئاگاداری (حذر) ئەو مەترسیەم کردن کە لییان نزیك دەبۆوە. بەم ریگەیە، توانیم ژیانی نزیکەی ٣٠ ئیرانی بیدەسەلاَت (بائس– عاجز) رزگار بکەمو، لەگەڵ خۆمدا بیانهینم بۆ بناب.

لە ٣ی ئەم مانگەدا گەیشتمە کامپی ئیرانیەکان لە بناب.

لە ٤ی ئەم مانگەدا لەشسکرەکەی تاران بەفەرماندەیی حشمە الدولە گەیشتە سەینکەلەچ. ژمارەی هیزە بەیەك گەیشتوەکانی ئیران ٢٠,٠٠٠ سەربازو ٢٠ پارچە تۆپخانەو ١٢یان تۆپی کرۆپ ن.

لەکامپی ئیرانیەکاندا، زانیم کە تەیمور پاشا خان لە پیکدادانیکدا لەنیوان سەلماسو ورمیدا، شیخ سادقی تیکشکاندبو. سوپاسالاریش هەروەها، هەمان هەوالی دامێ.

مار یوسفی مەترانی نەستۆری، لە نۆچیوە لەگەڵ شیخدا رۆیشتبو بۆ جەنگو، لە کامپی کوردەکان بو لە ورمێ. شیخ هەروەها ٣٠٠ کەس لە نەستۆریەکانی ناو چیای خستبوە ناو هیزەکەیەوە. تەواوی تیمی موسیقاژەنەکانی لەم خەلکانە پیکهاتبون.

پیشنیار دەکەم کە لە پۆستی داهاتودا هەلبژاردەی یادوەری رۆژانەکەم کە لە ورمێ دامناون. بۆ بەریزتان بنیرم، چونکە لەم فرسەتەی ئیستادا ئەوەندە کاتم نیە بۆت بنیرم.

ئیمرۆ سوپاسالارم بینیو، وەکو دەیگوت، ئەو لەو باوەرەدا بوە کە تەیمور پاشا خان توانیویتی گەمارۆکەی سەر ورمێ هەلگرێ (لابەرێ). پایەبلندی پیی راگەیاندم کە نیازی وایە، چەندیك زو بتوانێ بۆ خۆی بچیت بۆ سابلاَخ.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## ژماره: ٥٧

**له مستەر تۆمسن وه بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(به بروسکه له ٧ی کانونی دوەمدا وەرگیروه)**

**گەورەم،** **تاران، ٧ ك ١، ١٨٨٠.**

**ئەز شەرەفی ئەوەم هەیه به جەنابتان رابگەیەنم که زانیاری به حکومەتی ئیرانی گەیشتوه که شیخ عوبەیدوالله، لەگەڵ کورەکانیو هەمزاغای سەرەك خیلی ئیرانی، ئیستا بۆ ئەو دیو سنوری ئیران کشاونەتەوەو پەنایان بردوه بۆ خاکی تورکیا.**

**(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن**

## ژماره: ٥٨

**له مستەر تۆمسن وه بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(به بروسکه له ٩ی کانونی یەکەمدا گەیشتوه)**

**گەورەم،** **تاران، ٩ ك ١، ١٨٨٠.**

**هەر ئیستا بروسکەیەکم له کۆنسۆلی گشتی حکومەتی خاوەن شکۆوه له تەوریز به بەرواری ئیمرۆ پیگەیشت، تیایدا دەلیت که میرزا حسین خانی سوپاسالار مل دانەواندنی تەواوی مەرگەوەری به پایەبلند وەلیعەهد راگەیاندوەو، دەشلیت ئیستا نیزام زۆر ریكو پیکەو سەقامگیریش به تەواوی گیردراوەتەوه بەبیٚ له دەست دانی کات له سنوری کوردستاندا.**

**(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن**

## ژماره: ٥٩

**له مستەر تۆمسن وه بۆ ئیرل گرانڤیل– (له ٩ کانونی یەکەمدا گەیشتوه)**

**گەورەم،** **تاران، ١٧ی ت١، ١٨٨٠.**

**نیشانه بەنامەکەم له ١١ی ئەم مانگەدا،* ئەز شەرەفی ئەوەم هەیه رایبگەیەنم که له سەفیری تورکم بیستوه، بروسکەیەکی له سامت پاشاوه که فەرماندەی هیزەکانه له وان، پیگەیشتوه، دەلیت ئەو هەمو ئەو ریگایانەی گرتوه که کوردەکان لیوەی دەپەرنەوه بۆ ناو خاکی تورکیاو، هەروەها دەلیت، لەوانەیه کەسانی کورد هەبن**

---

* بروانه ژماره:١١

چوبیتنە ناو خاکی ئیرانەوە بۆ دانە پالی بزوتنەوەکە، بەڵام هیچ سەرخیلیك یان تەواوی خیلەکە بەشداری نەکردوە تیایدا. فەخری بەگ ئەم زانیاریەی داوە بەشا، کە پیی راگەیاندوە، ئامۆژگاری ئیعتماد الدولەو پاشا خانی کردوە، کە بەدوای یەکتریدا لە پیشەوە چوندان، یەکەم لە رۆژهەلاتو ئەوەی دواوە بەدریژایی کەنارەکانی دەریاچەی ورمێ، لە پەیوەندیکردندا بن لەگەڵ سامت پاشادا بۆ پشتیوانی چاکتری هیزەکان کە لەبەر چاویاندایە.

سەفیری تورکیا لۆمەی هەمو ئەم پشیویانەی سنور دەخاتە ئەستۆی حکومەتی ئیرانەوەو، دەلیت ئەو بە بەردەوامی، بەلام بێ هودە جەختی کردوە لەسەر دورخستنەوەی سەردارە کوردەکان کە، بەهۆی ئەوەی لەناو تورکیادا تاوانیان کردوە، خۆیان دەکەن بەناو ئیرانداو، ئەمانەن سەرکردەو هاندەری بزوتنەوەکانی وەك ئەمەی ئیستا. لەلایەکی تریشەوە، حکومەتی ئیرانی بەتوندی هەمو بەرپرسیاریەکی ناوەتە لاوەو، تورکیا تاوانبار دەکات بە "پاککردنەوەی ناوچەکانی" لەسەر سنوری ئیران.

بیگومان، شتیکی باش لە ئەنجامی ئەم تاوانبارکردنی بەرامبەرەو، تەنها نەخشەش بۆ ریگەگرتن لە رودانەوەی پشیوی سنورەکان، ئەوەیە هەردو حکومەتەکە ریککەوتنیك ئەنجام بدەن، کە لەریگەیەوە هەردولایان خواستیان دەربڕن، کاتیك لەبارەی مەسەلەکەوە بۆ لایەنیکی سیهەم قسە دەکەن، بەلام لەوە دەچێ سەبارەت بەجیبەجیکردنی نەتوانن بریار بدەن.

(ئیمزا) رۆنالد. ف تۆمسن

## ژمارە: ٦٠

لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٩ی کانونی یەکەمدا گەیشتوە)

گەورەم، تاران، ٢٩ی ت١، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپیچ تەرجەمەی بلاوکراوەیەك (اعلان دوری) بۆ رەوانە بکەم، کە لە وەزیری کاروباری دەرەوە ئاراستەی نیردراوە بیگانەکان کراوە، سەبارەت بەسەرهەلدانی کوردەکان لە ئازەربایجانو، هەروەها کورتەیەکی خالە بنچینەییەکانیو یاداشتیکو، بروسکەیەك کە میرزا سەعید خان بۆ منی ناردوە، سەبارەت بەو ریوشوینانەی کە بکریت بۆ دامرکاندنەوەی بزوتنەوەکە. سەرەرای ئەوەش، شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپیچ تەرجەمەی دو نامەی مونشیی (Moonshee) کۆنسولی گشتی بەریتانیا لە تەوریز بۆ بنیرم، باسی ئەو جەردەییو تالانیە دەکات

کە کوردەکان پاش جیهیشتنی سابلاخ کردویانەو، دەشلیت هێزیکی گەورەی کوردەکان لە نزیك ورمێ وەدەرکەوتون.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## هاوپیچی ای ژمارە: ٦٠

نامەیەك لە میرزا سەعید خان وە

تەرجەمە، ١١ی ت١، ١٨٨٠.

هەروەك بەریزان نوینەرانی زلهیزە بیگانەکان لە کۆشکی (بلاط- قصر) ئیراندا ئاگادارن، (هەندێ) کوردی درندەو شارستانی، وەکو عەبدوالقادرو سادقەی کورانی شیخ عوبەیدوالللەو، هەمزاغای مەنگور کە ناوی بە کردەوە خراپەکانی پیشوی دەرکردوە، لەگەڵ کەسایەتی خراپدا کە ئەوەندەی خۆیان شەرانیو خراپن، تاوانکاریان لیدەرچوە بەهۆی کرداری تەعەدا کردنەوە کە شتیکی سروشتیە بۆیان، لەسەر سنوری تورکی- ئیرانیو لە سابلاخو مەراغەشدا.

حکومەتی ئیرانی، لە سۆنگەی ئەرکەکانیەوە بۆ پاراستنی ناوچەکانی ناوەوە، وە هەروەها سنورەکانی، وە بۆ مسۆگەرکردنی سەلامەتی مرۆڤ بەگشتی، پەیمانی ئەوەی داوە کە کۆتایی بهینیت بەم کردەوە زەرەربەخشانە بەریگەی سەربازیو خۆپاراستنی ترەوە (بۆ ئەو کۆتاییە). سەرەرای ناردنی هیزی پیادە، سوارەو، تۆپخانەش کە دەبو لە تەوریزو دەوروبەرەکەی بن، بۆ لەناوبردنی هەر نیازیکی تالانی لەلایەن ئەم خەلکانەوە، کەمەبەستیان تەنها تالانیو جەردەییە؛ وە گریمانەکانیش ئەوەیە کە ئەم هیزە بەش دەکات (کافیە)، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا خوا نەکردە- گەر ئەم کارە بەو شیوەیە بە ئەنجام نەگەیەندرا وەك حکومەت دلسۆزانە دەیخوازێ، وا کامپیکی تەواوی پیادە، سوارە، لەگەڵ تۆپخانەدا بە فەرمانو فەرماندەیی پایە بلندی شاهی حشمەت الدولەدا ریکخراوەو فەرمانو ئامۆژگاری تەواویشی (پێ دراوە). دەبێ بەبێ دو دلیو دواکەوتن، بەهەمو خیراییەکەوە بۆ ناوچە پر (پشیویەکان) بروات، (لەویش) وەك لەسەر هەمو حاکمیك پیویستە، هەنگاوی پیویست بنیت بۆ ئارامیی سنورەکەو، هەروەها ئاسایشی دانیشتوانی ناوچە (پەلاماردراوەکان)؛ وە لەجیبەجیکردنی فەرمانە بەجیکانی گەورەی خاوەن شکۆدا، دەبێ هیچ ئاساریکی ئەم کوردانە نەهیلیت.

بەپیی شیوازو مامەلەکردن (عرف- معاملە) لەنیوان کارمەندەکانی دەولەتە زلهیزە دۆستەکاندا کە هەمیشە بابەتی هەواڵو روداوی (گرنگ) بۆ یەکتری دەنیرن،

وەزیـری كاروبـاری دەرەوە، وەك نوینــەری هـیزیكی گــەورەی دۆسـت بـە بـەریزت دەگەیـەنیت‌و بە پیویستیشـی دەزانیـت پیـت رابگەیـەنیت كـە، بـەپیی ئـەو زانیاریـە نهینی‌یانـەی بـەوەزیرە ئیرانیـەكان گەیشـتوە هـەندێ خـەلك كـە هیـچ زانیاریـەكیان دەربارەی رەفتاری باندو خیلە درندەكان نیەو، بێ ئاگاشن لـەو شیوازە سروشتیەیان بـۆ تـالانی‌و جـەردەیی– وایــان بـاوەر كــردوە كــە ئــەم لەشكركیشـیـەی كوردەكـان سەرچاوەیەكی زیانە بۆ دەولەتەكەو ئەم میللەتە– وا دەردەكەویت كە هیچ گومانیك نەبیت لەوانەی ئەو خەلكانە بیری لیدەكەنـەوە كە لەسـەرەوە– ئاماژەیـان بۆ كـراوە–، چونكـە (هـۆی) جولانەوەكـە سـنورداره بـە خۆشەویسـتی نـەریتی ئـەم كوردانـە بــۆ راووروتو جەردەیی، هەروەك زۆر جار كردویانەو، بەهۆشیەوە سەرجەم سزا دراون.

بـەلام ئیسـتا، بـەدانانی ریوشـوینی خـیرا، بـەناردنی لەشـكر، وە بـە هــەنگاوی كاریگەرانــە بـۆ نەهیشـتنی شـوینەواریان زۆر بـەزویی ئــەم خەلكانــە بــە تــەواوی لەناودەبرین‌و رەگی ئەم زیان‌و خراپەكاریەشیان لە ریشە دەردەهینرێ.

بیگومان ئەو حكومەتەی كە بەریزتان نوینەرین، لە سۆنگی دۆستایەتیەوەی (بۆ ئیران) بەهیچ جۆریك بەرهەلستی ناكات بۆ دانانی ریو شوینی پیویست (بۆ كۆمەكی) و پشتیوانی لیكردنی مەعنەویمان بـۆ جیبـەجیكردنی گیرانـەوەی ئاشـتی‌و ئـارامی لەسەر سنور.

## هاو پیچی ۲ی ژمارە:٦٠

كورتەی خالەكانی بیرخەرەوە (مذكرە) لە وەزارەتی كاروباری دەرەوەی ئیرانەوە بۆ نوینـەری (موفد)

بەریتانیا، لە ٦ی زو القعدە، ۱۲۹۷ (۱۲ی ت۱، ۱۸۸۰.

لە حكومەتی ئازەربایجانەوە، بە بروسكە زانیاری گەیشتوە، كە هـەمو ئـەو كەل‌و پەلو تفاقانەی پیویست بون بۆ لەشكرەكان بۆ دامركاندنـەوەی یاخیبونی كوردەكان لەسەر سنورو، رۆژانە لەلایەن وەلیعەهدی پایـە بلنـدەوە دەنیردریت بۆ ئاسانكردنی جموجولی ئەو لەشكرانەی كـە ناسـراون بـە "فەوجـەكانی جەنـەرال"، لـە مەراغـەوە بـە نامەیەكـەوە گەرابونـەوە دەیگـوت، هـەر ئـەوەندەی دو فەوجەكـە گەیشـتبون ئـارامی گیردرابۆوە نیو دانیشتوانەكانی ئەو ناوچەیە.

نامەیەكی تریش لە بناب وە گەیشتبو، هـەوالی ئـەوەی هینـابو كـە هـەمزاغاو ئـەو یاخیبوانەی لە میاندواو لەگەلیدا بون، ناوچەكەیان چۆلكردوەو كشاونەتەوە.

بەجۆریك حكومەتی ئیرانی هەولی بەردەوامی داوەو ئیجرائاتی كاریگەریشی كردوە بۆ دامركاندنەوەی یاخیبونەكە، كە پیشبینی دەكریت كە زۆر بەو زوانە هەمو زەمینەو هۆی نارازیبون لاببریتو ناوچەكەش بگیردریتەوە بۆ دۆخی ئارامی.

ئەو تەفاسیلەی خوارەوە لە تەوریزەوە گەیشتوە، بیگومان سەرنجی نیردراوەكە رادەكیشیّ:

بەگویّ رایەلی بۆ فەرمانەكانی شا، ئامۆژگاری تایبەتی بۆ ئیعتماد السلطنە نیردرابو كە چەندیك خیرا بتوانریّ تەقەمەنی بۆ فەوجەكەی گیرۆس بنیردریتو، تەنانەت كەتیبەیەكی سوارەش بنیرن بۆ پاسەوانیكردنیان بۆ كامپەكە.

۳۰۰ باری تەقەمەنی كە لە تەوریزەوە رەوانەكرابو، گەیشتبونە كامپەكەو، ۱۵۰ی تریش لەگەڵ خیوەت، ئەسپ، تۆپخانەو، شتی پیویستی تردا، هەشت یا نۆ رۆژ لەوەپیش لەخۆیەوە نیردرابون.

بەو جۆرە، هەر ئەوەندەی تەقەمەنی لە كامپەكەوە گەیشت، زو دەدریتە فەوجەكانی ئەو نزیكانە.

ئەو خیوەتانەی پیویست بو لە ئامادەكردندان؛ ئیستا بەشی چوار یان پینج فەوج نیردراوەو، ئەوەشی ماوە بەدوایدا دیت.

لەدو قۆلی جیاوازەوە تۆپ بۆ ئیقبال الدولە نیردراوەو، بروسكەیەكی دواتر پیمان رادەگەیەنیّ كە ئەو هیزە زیادو تەقەمەنیانەی بۆ بەریزی نیردراوە، گەیشتویتیّ.

ئەوەندە نابیت كە ئیعتماد السلطنە، كامپەكەی خۆی لەگەڵ ئەوەكەی سەرتیپ ئاغا خاندا یەكخستوەو، هەردوكیان بەهیوان كە لەرۆژیك یا دو رۆژدا لە بناب وە روەو سابلاخ بكەونە ریّ.

بەدریژایی ریگاكە لە تەوریزەوە بۆ كامپەكە، بازگەی پۆست دانراوەو، هەمو ریكخستنیكمان كردوە بۆ ئەوەی بە بەردەوامی زانیاریمان دەربارەی هەمو ئەوەی تیدەپەریّ بدەنیّ.

## هاوپیچی ۳ی ژمارە: ٦٠

**نامەیەك لە مونشی (Moonshee) كۆنسوّلی گشتی بەریتانیاوە لە تەوریز.**

(تەرجەمە) ۸ی ت۱، ۱۸۸۰.

شیخ عەبدوالقادری كوری عوبەیدواللەو، هەمزاغای سەرخیلی مەنگور، لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر هاتن بۆ ئودولتو و لەویشەوە رۆیشتن بۆ سولدوزو، بەبیّ هیچ بەرەنگاری بونەوەیەك چونە ناوچەی سابلاخەوە.

حاکمەکە سابڵاخی جیهیشتوەو رۆیشتوە بۆ موشمیت ئابود، کە دو فرسخیك لە مەراغەوە دورەو، بەدواب ناسراوە.

عەلی خانی حاکمی مەراغە، دەسوپیوەندەکەی خۆی لەگەڵ تۆپیکدا بردوە بۆ پاراستنی دواب. حاجی میرزا عەبدوالقاسمی حاکمی دواب، کە لەویوە هەڵاتبو دەلیت، بە گەیشتنی عەلی خان بۆ دواب، پاش نیوەرۆی ٢ی تشرینی یەکەم لەلایەن شیخ عەبدوالقادرو هەمزاغا لەگەڵ ١٠,٠٠٠ کەسدا پەلاماریان درابو. هیرشەکە سێ سەعات پیش رۆژ ئاوابون کرابو و تا چوار سەعات دوای ئەوەی خایاندبو. سەلیم خان، چهار دەولەت، عەلی خان، حاکمی مەراغە لەگەڵ موحەمەد حسین خانی بەختیاری، تا تەقەمەنیان تەواو بوبو لەناو قەڵاکەی دوابدا خۆیان گرتبو، دوای ئەوە ناچار بون هەلبین.

هەمان ئەو شەوە، کوردەکان دەستیان کرد بە کۆمەڵ کوشتنی دانیشتوانەکەی دواب، لاوو پیر، نیرو مێ. هەندیکیان هەلدانە ناو ئاگرەکەوە، ورگی هەندێ لەژنەکانیان هەلدریو، مەمکی ژنی تریشیان لیکردەوە. سەری شیخ الاسلام، مەلا جەعفەریان بریو کردیان بەسەر نیزەیەکەوە. باقی ژنو منالەکانیان بەدیلی برد. خوا دەزانێ لەوێ چ کاریکی تریان ئەنجامداوە.

پاش بردنو، تاڵانو بەکۆمەل کوشتنی دواب، سوارەی کوردەکان پیشرەویان کرد بۆ مەراغەو، گەمارۆی بورجەکەی مەراغەو گوندی دواب یاندا. حاجی ئاغا عەلی نازی بوابی خستبوە حالەتیکی بەرگریەوەو، سەرهەنگ قاسم خانی کوری حسین پاشا خان تا ئیستا شاری مەراغەی پاراستوە.

لە راپۆرتیکدا کە دوینێ گەیشتوە، سەرهەنگ ئاغا خانی ئەفشار، کە چەند رۆژیك لەوەبەر لەگەڵ دو فەوجی پیادەو چوار تۆپدا تەوریزی جیهیشتوە، ریك لەکاتی خۆیدا گەیشتوە بۆ رزگارکردنی بواب، چونکە گەر دو یا سێ سەعات درەنگتر بگەیشتایە، کوردەکان شوینەکەیان دەگرت. ئاغا خان خۆی نوسیویتی دەلیت، بە گەیشتنی بۆ بواب، کەوتۆتە شەر لەگەڵ کوردەکانو شکاندونیو، ناچاری کردون نیو فرسەخیك پاشاکشێ بکەن.

دوینێ، ئیعتماد السلطنەش هەروەها لەگەڵ فەوجیکی تری پیادەو ١٠٠ بار تەقەمەنی، تەوریزی جیهیشتوەو چوە بۆ لای ئاغا خان.

کوردەکان، دوای ئەوەی دواب یان گرت، گوندەکانی دەوروبەری مەراغەیان کاولکردوەو هەمو بەرو بومەکانیان بەتاڵان بردوە. دانیشتوانەکان هەمو پەرشو بڵاو بونو هەڵاتون.

گوندەکەی م. مەنوهجی، حاجی بەهزاد، لەگەڵ ئەوەکەی قەرەچاپوك کە هی م. قەسە بۆیزەو، هەروەها خانوبەرەکەی خوالیخۆشبو، خیزانی دکتۆر کۆچران، تالاّن‌و کاولکراوە.

## هاوپیچی ٤ی ژمارە: ٦٠

### نامەیەك لە مونشی کۆنسوڵی گشتی بەریتانیاوە لە تەوریز

(تەرجەمە) ١٢ی تشرینی یەکەمی، ١٨٨٠.

لە هەوالیکەوە کە ئەوەندە نابیت گەیشتوە، شیخ عوبەیدوالله لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە اتباعەکانی لەبەردەم شاری ورمیٚدایەو، بۆ مەسافەی سیٚ فرسەخیك لەشارەکەوە بارگەی خستوە.

ئیعتماد السلطنە، هیشتا لە بواب‌و مەراغەیە لەگەڵ سەرهەنگ ئاغا خان جەنەراڵ حەسەن عەلی خاندا. هیچ پیکادانیکی تر لەویٚ رووینەداوە. کوردەکان، کە لە دەوروبەری بواب‌و مەراغەبون، کشاونەتە دواوە بۆ دواب کە ٦ فرسەخ دورە، بەلاّم هیشتا هەر خەریکی تالاّنین‌و کاولکردنی ئاواییەکانی دەوروبەرن.

## ژمارە: ٦١

لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل (لە ٩ی کانونی یەکەمدا وەرگیراوە)

گەورەم، تاران، ٣١ی ت١، ١٨٨٠.

چنگ کەوتنی زانیاری تەواو لیرە زۆر گرانە، سەبارەت بەوەی کە لە ورمیٚ‌وولایەتی ئازەربایجاندا چی رو ئەدات، بەشیوەیەکی گشتی لەبارەی یاخیبونی کوردەکانەوە. لە تەوریزیش هەمان گرفت مان بەرەنگار دەبیتەوە، م. زینوڤیڤ پیی راگەیاندوم کە، لەبەر ئەوەی نەیتوانیوە لەویٚ هەوالیکی باوەرپیکراوی دەست بکەویت، ناچار بوە یەکیٚ لە کارمەندە هاوولاّتیەکانی کۆنسوڵگاکەی بنیریت بۆ مەراغە، بۆ ئەوەی دەستبەجیٚ هەواڵ بزانیت.

مستەر ئابۆت، لە ٢ی تشرینی یەکەمدا گەیشتە ورمیٚ‌و، لەو بەروارەشەوە دو جار (نامەی بۆ ناردوم). لە نامەیەکدا بە بەرواری ٧ی ئەم مانگە باسی دۆخی ئەو رۆژە دەکات لە ورمیٚ‌و ئەو زانیاریە دەگەیەنیت کە پیی گەیشتبو، سەبارەت بە پیشرەوی کردنی کوردەکان لە سابلاّخ‌وەو ئەو راوو روتیەی لەناوچەی مەراغە کردویانە. لەنامەیەکی ١٤ی ئەم مانگەدا باس دەکات کە هەمو ئەو زانیاریانەی کۆکردۆتەوە کە پیویست بوە بۆ ئەوەی بتوانیت لەسەر دوخیٚ نەستۆریەکان راپۆرت

بداتو، پیشنیاری کردوه کە لە ١٨ی مانگدا تەوریز جیهیلیت، بەلاَم میسیونیرە ئەمریکاییەکان بەپەرۆش بون بۆ ئەوەی حەفتەیەکی تر بمینیتەوە. تەنها زانیاری کە پیم گەیشتوە سەبارەت بە جموجولەکانی هەوالە بلاَوەکەی ئیرەیە لەناو ئیرانیەکاندا، کە لە ورمیّ دەرچوە پیش ئەوەی شارەکە گەمارۆ بدریت، بەلاَم ناچار کرابو کە بگەریتەوە چونکە ریگاکانی تەوریز لەلایەن کوردەکانەوە داگیر کرابون.

مستەر ئابۆت کۆپی دو لەو نامانەی کە شیخ لەم دواییانەدا ئاراستەی یەکی لە میسیونیرە ئەمریکاییەکانی ورمیّی کردبو، بۆ ناردوم، تیایدا بەکورتی دوپاتی ئەو بابەتە گازەندانە دەکاتەوە کە دژ بە ئیرانیەکان هەیەتیو، دەلیت عەبدوالقادری کوری نیردراوە بۆ ئەم ولاَتە بۆ مەبەستی وە دەستهینانی ریگەچارەیەك بۆ ئەم زولمو گازەندانە.

شیخ هەروەها دەلیت، ئیستا خۆیو هەمو سەرخیلە کوردەکان ریکەوتون لەسەر دامەزراندنی کوردوستانیکی یەکگرتو، بۆ ئەوەی لە دۆخیکدا بن بتوانن خۆیان کاروباری خۆیان بەریوە ببەن بەبیّ دەستیوەردانی دەسەلاَتدارانی تورك یان ئیرانی. رونکردنەوەی شیوەی ئاوا لەو نامانەشدا هەن کە بۆ حاکمی ورمیّی نوسیون. گومان لەوەدا نیە کە ئامانجی شیخ لەمانەو لە وتارو ئەو نامانەی کە بەم دواییانە ناردونی بۆ سەرخیلە جۆراوجۆرەکان بەدریژایی سنوری ئیران، جیاکردنەوەی هەمو دانیشتوانە کوردەکان لە تورکیاو ئیرانو، پیکهینانی ئەمارەتیکی ئۆتۆنۆمی جیا بوە لەژیر قەلەمرەوی خۆیدا، وە بۆ گەیشتنیش بەم ئامانجە، هەولئەدا بە هەرەشەو گفت هانی هەمو خیلە کوردەکان بدات تا لەم ململانیّ کراوەدا لەگەلّ ئەم ولاَتەدا بدەنە پالی.

لە ٢٩ی ئەم مانگەدا، دو کەس لە پیاوەکانی شیخ عوبەیدوالله گەیشتنە تاران، بەنامەو پەیامی نهینی لە شیخەوە بۆ شازادە عەباس میرزای برای شا، پیی رادەگەیەنیّ کە ئیستا هیزیکی گەورەی کوردەکان چونەتە ناو ئازربایجانو، داوا لە پایە بلندی شاهانەی دەکەن کە هیچ کات بەفیرۆ نەدات بۆ دانەپالّ یاخیبوەکانەوە. عەباس میرزا بەشی زۆری ژیانی لە نەفیگە لە تورکیادا بەسەر بردوە؛ سەرەرای ئەوەش، خۆی کە نیو کوردە، چونکە دایکی کچی یەکیك لەسەردارە کوردەکانی نزیك ورمیّ بوەو، ئەگەر نامەکەی شیخ بگیرایە پیش ئەوەی بگاتە دەستی، وا پایە بلندی شاهانەی دەکەوتە مەترسیەوە. ئەوەی رویدا، نیردراوەکانی بەگرتداو، دەستبەجیش مەسەلەکەی بەشا گەیاند.

دوا زانیاری باوەرپیکراو کە دەربارەی دۆخی ئیستای کاروبارەکانی ورمیّ بەمن گەیشتوە ئەوەیە کە، بەگەیشتنی لەشکرەکانی ئیران بۆ مەراغە، کە بە فەرماندەیی

ئیعتماد السلطنه له تەوریزەوە نیردرابون، بەشیکی هیزەکەی عەبدوالقادر لەناوچەکە بەرەو لای سابلاخ کشایەوە، لەویشەوە بەلای رۆژئاوای دەریاچەکەدا پیشرەویان کرد بۆ سەر ورمێ. ژمارەیەك له کوردەکان، نزیکەی ٥,٠٠٠ کەس بە فەرماندەیی خەلیفە محمد سەعیدی زاوای شیخ عوبەیدوالله، دو حەفتەیەك لەمەوبەر بەماوەی ٢٤ میل لەو شارەوە بارگەیان خستبو. تومای برادۆستو، شیخ سادقی کوری شیخ عوبەیدوالله، لەگەڵ ١٠٠٠ کوردا، هەروەها له نیرغی دەشتی مەرگەوەردا بارگەیان خستوە. هەواڵ واگەیەندراوە کە ئەم کوردانە هەمو باش بە مارتینی چەکدار کراون، ئەم چەکانەش بە تالانی، دو ساڵ لەمەوبەر لە بایەزید چنگیان کەوتوە.

وا باسدەکریت، هیزەکەی بەردەستی ئیقبال الدولەی حاکمی ورمێ، تەنها لە سێ فەوج پیکهاتوە، کە لەوانەیە هەر یەکەی لە ٥٠٠ کەس زیاتر نەبیت.

بە هەرحاڵ، لەوەتای سەرهەلدانی کوردەکان دەستی پیکردوە ئەم هیزە زیادانەی خوارەوە بۆ ناوچەکانی مەراغەو ورمێ رەوانەکراون:

*هیزیکی نیزامیو سوارەی غەیرە نیزامی، مەزەننە دەکریت بە ٣,٠٠٠ کەس. لە تەوریزەوە بە فەرماندەیی ئیعتماد السلطنەنیردراوەو، ١٠ رۆژ لەمەوبەر گەیشتوتە مەراغە.

*تەیمور پاشاخانی حاکمی خوی، لەگەڵ ٥,٠٠٠ سەربازو ٦ تۆپدا، لە تەوریزەوە نیردراون بۆ ماکۆ، لە ٢٤ی ئەم مانگەدا گەیشتونەتە سەلماسو، وا چاوەروان دەکرێ دوینێ گەیشتبنە ورمێ.

*هیزیکی مەزەننەکراو بە ٤,٠٠٠ کەس بە فەرماندەیی حەمزە میرزا، حشمة الدوله کەمامیکی شایە، لە تارانەوە بەریگای بیجارەوە نیردراوەو، چاوەروان دەکرێ کە لە چەند رۆژیکی کەمدا بگاتە ناوچەی سابلاخ. حەمزە میرزا پینج ئەفسەری نەمسایيو ١٢٠٠ سەربازی ئیرانی کە فیرکەرە نەمساییەکان رایانهیناون لەگەلدایە، چەکدارن بە تفەنگی داگیراو، کەتیبەیەکی تفەنگچیەوە.

*کەتیبەیەکی تر لە هەمەدانو گیرۆسەوە، بە فەرماندەی حەسەن عەلی خان نیردراوە، بریتیە لە دو فەوجو ٧٠٠ کەس غەیرە نیزامی. واباسدەکریت کە گەیشتبیتنە مەراغەو پەیوەندیان بەهیزەکەی ئیعتماد السلطنه وە کردبیت.

لەبەر ئەوەی سوپاسالار رایگەیاندبو کە دو فەوجی ترو ژمارەیەك لە سوارەی غەیرە نیزامی ئەردەبیل کە وایدانابو بیاننیریت بۆ مەراغە، ئامادە کردبو، پیشنیارم کرد کە ئەمانە لە تەوریزەوە راستەوخۆ بنیردرین بۆ ورمێو، ئەوەش کە هەروەها فەرمان بە ئیعتماد السلطنه بکریت بەبێ لەدەست دانی کات لە مەراغەوە پیشرەویی بکات بەلای باشوری دەریاچەکەدا بۆ ناوچەی ورمێ، چونکە هیزی زیادە بۆ ئەوێ

زۆر به پەلەو پیویست بوو، لەبەر ئەوەش کە لەوانەیە لەم کاتەدا مەراغە تارادەیەك سەلامەت بوبیّ، چونکە کوردەکان لەو قۆلەوە دەستیانکردبو بە کشانەوەو، حشمە الدولە خەریك بو دەگەیشتە ئەو نزیکانەو؛ ئەم پیشنیارەش بە فەرمانی شا بە بروسکە دراوە بە سوپاسالار.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بۆ زانیاری جەنابتان، کۆپی نامەکەی مستەر ئابۆت لە ٧ی تشرینی یەکەمدا، لەگەڵ تەرجەمەی نامەکانی شیخ عوبەیدوالله بۆ میسیونیرە ئەمریکاییەکانو عەباس میرزا، بنیرم. هەروەها کورتەیەکی خالەکانی نامەکەی شیخ بۆ حاکمی ورمیّ، پیکەوە لەگەڵ تەرجەمەی راپۆرتیك کە عەباس میرزا ئاراستەی وەزیری کاروباری دەرەوە کردوەو، بروسکەیەکی سوپاسالاریش، کە حکومەتی ئیرانیئەم پاش نیوەرۆیە بۆ منی رەوانە کردوە، دەنیرم.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## هاوپیچی ١ی ژمارە: ٦١

**لە ئابۆتی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆ مستەر تۆمسن**

بەریز، ورمیّ، ٧ی ت١، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە رایبگەیەنم کە، بە گەیشتنم بۆ ورمیّ لە ٢ی ئەم مانگەدا، یەکەم هەواڵ کە پیم گەیشت ئەوە بو کە لەشکریکی گەورەی کوردەکان بە فەرماندەیی شیخ عەبدوالقادر کە یەکیکە لە کورەکانی شیخ عوبەیدوالله، لە شنۆوە پیشرەوی کردوە بۆ سەر سولدوزو، لەویّ بەرەنگاری هیزیکی قەرەپاپەکانو کوردەکانی مامش بونو، ئەمانیش کاتیك بینیان بەرگریکردن بیّ هودەیە، تەسلیم بە شیخ بونو، دایانە پاڵ لەشکرەکەی. حاکمی سولدوز زەخیرەی پیویستی بە شیخدا بۆ لەشکرەکەیو، ئینجا روەو سابلاّخ کەوتنە ریّ. کە شازادە حاکمی ئەو شارە نزیکبونەوەی هوروژم هینەرەکانی بیست، هەر ئەوساتە دەرچو بۆ تەوریز. بەو جۆرە، کوردەکان بەبیّ بەرەنگاری کردنی دانیشتوانەکەوە، چونە ناو سابلاّخ وەو، هەروەها زەخیرەشیان درایە پاشان شیخ لەگەڵ لەشکرەکەیدا کشان بۆ میاندواو مەسیحیەکانی دانیشتوی سولدوز لەلایەن کوردەکانەوە سەغلەت نەکرانو، لەو کاتەشەوە دەستیان لەخراپ مامەلەکردنی دانیشتوانە شیعەکانی سەر ریگاکەیان دەپاراست، بەلاّم

واباسدەکریت کە دو نەستۆری روتکراونەتەوەو کوژراون لەلایەن هەندێ لەو کوردە جەردانەی لە پاشاندا بەدوای لەشکرەکەدا هاتبون.

دوینێ، لیرە راگەیەندراوە کە چەندین پایەمبەر لەلایەن شیخ عەبدوالقادرەوە نیردراون بۆ میاندواو داوای زەخیرەو کەلوپەلیان کردوەو، واشباسدەکریت کە دانیشتوانەکان تەنانەت گوییان لە پەیامەکەشیان نەگرتوەو، سەربردراون، شیخیش کەللەیی بوەو بە پەلە لەگەڵ لەشکرەکەیدا چوە بۆ میاندواو، شارەکەی تالانکردوەو دانیشتوانەکەشی بەکۆمەڵ کوشتوە. لەلایەکی تریشەوە، واتەواتیك بوە کە سولەیمان خانی ئەفشار بەهیزیکی چار دەولەوە (Tchar dowlehs) کەوتۆتە شەر لەگەڵ کوردەکاندا لە میاندواوو هەردولا زیانی گەورەیان لیکەوتوە، بەڵام لەئاکامدا، عەبدوالقادر لەگەڵ لەشکرەکەیدا کشاوەتەوە دواوە بۆ سەر سابلاخ.

بەم دواییانە نەستۆریەکی پروتستانت لە گەوەرەوە هاتۆتە ئیرە، دەیگەیەنیت ژمارەیەکی زۆر لە سەردارو خیلی کورد لەو ناوچەیەدا کۆبونەتەوە. ئەمانە لەهەمو بەشەکانی کوردستانەوە بەدەوری بەیداخەکەی شیخ عوبەیدوللەدا کۆمەلەیان کردوە، چونکە شیخ لە ریگەی یەکیك لە ئەفسەرە ئەساسیەکانیەوە کە نامەکانی بۆ ئەو مەبەستە بڵاوو دابەش دەکات، بانگهیش کردبون.

دوابەدوای گرتنی سابلاخ، قەڵاکەی لاهیجان تەسلیم بە کوردەکان بو، لە ئەنجامدا تۆپەکانیان لەکارخستو پادگا ئیرانیەکەشیان بە ٢٠٠ دیلەوە گرت.

راگەیەندراوە کە نەخشەکەی شیخ عوبەیدوللە، پەلاماردانی ئیرانە بەسێ لەشکری جیاوە. یەکەم لەشکر دەنیردریتە سەر خۆیو سەلماس، دوهەم بۆ سەر مەرگەوەرو ورمێ، سیهەم بۆ سەر سابلاخو تەوریز.

حالی حازر، ورمێ لەژیر هەرەشەی لەشکریکی کوردەکاندایە، کە وەك دەلین ١,٠٠٠ کەسن، بە فەرماندەیی شیخ سادقی کوری شیخ عوبەیدوللە. ئەم هیزە بارگەی خۆی لە نیرغی، کە لە ئەترافی دەشتی مەرگەوەر، بەدوری ٢٤ میل لەم شارەوە، لیداوە.

هیچ شتیك نیە ری لە شیخ سادق بگرێ بۆ کشانو داگیرکردنی ورمێ. ئەو هیزانەی کە لەبەر دەستی (تحت تصرف) ئیقبال الدولەدان، بەناو دو فەوجن، بەڵام لەناوچەکەدا پەرشو بڵاوبونەتەوەو، گەر کوردەکان لەپر پەلاماری ورمێ بدەن، زۆر زەحمەتە حاکمەکە بتوانیت بەرگری بکات. ناتوانیت بەهەموی زیاتر لە ٧٠٠ کەس کۆبکاتەوەو، ورمێش بیگومان هەمان چارەنوسی سابلاخی دەبێ.

دیداریکم لەگەڵ ئیقبال الدولە، کە بارگەی لەدەرەوەی شار لیداوە، کردوە. بیگومان، وەلیعەهد ئەم دۆخە پر مەترسیەی کە هەرەشە لە سەلامەتی دەسەڵاتی

حکومەتەکەی دەکات، بەشا گەیاندوە؛ چونکە ئەگەر حکومەتی ئیران ئامادە نەبیت هیزی تەواو بهینیتە ناو مەیدانەکەوە بۆ بەرەنگاریکردنی لەشکری کوردەکان لە میاندواو، وا شیخ عەبدوالقادر بەردەوام دەبیت لەکشان بەرەو تەوریز.

دوینێ پیم راگەیەندرا کە ئیعتماد السلطنە بەچوار فەوجەوە بەریگەوە بوە بۆ ورمێ؛ هەروەها هیزی تریش بەپەلە روەو میاندواو دەگوازریتەوە بۆ بەرپەرچ دانەوەی (رد) شیخ عەبدوالقادرو، لەشکریکیش لەخۆی مۆڵ دراوە.

لەنامەکاریەکانی پیشومدا لەگەڵ بەریزتانو وەزارەتی دەرەوەی حکومەتی خاوەن شکۆدا، بە بەردەوامی ئەو مەترسیەم رونکردۆتەوە کە بۆ حکومەتی ئیرانو دانیشتوانە مەسیحیەکانی ئەم ناوچانە پەیدا دەبیت ئەگەر ریگە بە شیخ عوبەیدوالله بدریت ببیتە خاوەن نفوزی بێ سنور لەناو هۆزە کوردەکانی نیو سنوری ئیراندا؛ بەڵام لەوە نەدەچو حکومەتی ئیرانی درکی بەوە کردبیت کە مەترسیەکە نزیکە. ئیستا شیخ هیچ نهینیەکی نەهیشتوە لە نیازەکانیدا. پرۆژەکەی ئەوەیە کە خۆی بەسەرۆکی ئەمارەتیکی کوردی دابنیت و، هەمو کوردستانیش لە تورکیاو ئیراندا، بلکینیت بەیەکەوە.

میسیونیرە ئەمریکاییەکان پیم رادەگەیەنن کە پەیوەندی دۆستایەتی باشیان لەگەڵ شیخ عوبەیدواللەدا هەیەو لەوە ناترسن کە تەنگ بە مەسیحیەکانی ورمێ هەلچنێ گەر ناچار بون تەسلیم بە لەشکرەکانی ببن. میسیونیرەکان نامەیان بۆ نوسیوە، داوای لیدەکەن ریز لە ژیانو ماڵو مولکی دانیشتوانە مەسیحیەکان بگریت لەم شالاوەی ئیستایداو، پیشنیاریان کردوە کە هەمان ریگە بگرم؛ بەڵام نەمویستوە ئەوە بکەم، چونکە وام بیرکردۆتەوە کە شتیکی باش نابیت بۆ من نامەکاری، ئەو نامانە هەرچیەکیش بن، لەگەڵ سەرۆکیکی کوردا بکەم، کە هیرش دەکاتە سەر دەسەڵاتو خاکی شا. من وای بەباشتر دەزانم کە چاوەروانی رەوتی روداوەکان بم و، باوەرت هەبیت کە بەخیرایی گەیشتنی هیزە زیادەکان بۆ ئیرە، ئیقبال الدولە لەم دۆخە نارەحەتەی ئیستای رزگار دەکات.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپیچی ٢ی ژمارە: ٦١

له شیخ عوبەیدواللەوە بۆ دکتۆر کۆچران

(تەرجەمە) ٢٥ی ئەیلول، ١٨٨٠.

بیگومـان تـۆ بیسـتوته کـه چـۆن لەسـاڵانی پیشـودا شـوحاع الدولـه بـوه هـۆی سەربرینی ٥٠ کەس له لایەنگرەکانم، بەبێ هیچ خەتاو تاوانیك و، زیاتر له ١٠٠,٠٠٠ تومەنیشی زەرەر لیدام.

عوسمانیەکان و حکومەتی ئیران، هیچ کامیان نیازیان پاك نیه. هـەرگیز خۆیـان لەقەرەی مافەکانمان نادەن. سەرەرای ئەمەش، بەجۆریکی وا لـه فـەرەج الله خـانی، کوری حاجی غەفور خان که یەکیك بوه لەسەرۆك خیلەکانی شنۆ داوه، که یەکسـەر مردوه. دیسان، سالی پاریش موعین الدوله عەبدوالله خانو ئیبراهیم خانی خەلکی شنۆی بردو ٢٠,٠٠٠ تومەنی غەرامه لیسەندون، بەو شیوەیه، بەتەواوی مالەکانیانی کاولکردوه. هەروەها ١٠ ژنیشی به دیلی بردوه. ئیمساڵ، حاکمی ناوچەی موکری عەبدوالله بەگی برد، هـەروەهـ کەوته سزادانی، وه هەرچەنده بێخـەتاش بـو ١,٥٠٠ تومەنی غەرامه کرد. دیسان هەندێ ژنی خیلی تونکوی بەزۆر لەمیردەکانیان سەند. لەو ماوه کورتەی دواییدا، حـاکمی سـابلاخ بـەناوی پیشـاندانی بـاوەرو متمانـەوه؛ هەمزاغای مەنگوری که سەرۆك خیلی چەندین خیلی ئەو ناوچانەیه دەعوەت کردبو بۆ سابلاخ، بەلام لەراستیدا بەمەبەستی گرتنو زیندانکردنیان بوه. هەمزاغا توانیبوی لـه ژورەکـه دەربـاز بێ، لەریگەکەیدا دوکەس بکوژێو، بەنارەحەتیەکی زۆرەوه خـۆی رزگار بکات. ناتوانرێ ئەنجامی ئەم جۆره روداوه پر له زەبرو زەنگو چەوساندنەوانه باس بکریت. بەهۆی ئەم جۆره کردەوانەوه بوه که کوردستان ناچار بوەو، ناچاریشه بەپیویستی یەکبونو، (لەوەش زیاتر) ناتوانێ خراپەکاریو مالویرانی هەلگرێ. لەبەر ئەوه، ئیمه زۆر تکاتان لیدەکەین که ئەو مەسەلەی دواوه ئاگادارو، رون بکەنەوه بۆ کۆنسـۆلی بـەریتانی لەتـەوریز، بـۆ ئـەوەی، خوایاربـێ، دوای وردبونـەوه لەسـەر مەسەلەی کوردستان، بکەویته بەر باسو لیکۆلینەوەوه. بۆ ئەوه، مەلا سمایلم ناردوه بۆ رونکردنەوەی ئەو مەسەلەیەی ئاماژەی بۆ کراوه.

## هاوپیچی ٣ی ژمارە: ٦١

### له شیخ عوبەیدوالله‌وه بۆ دکتۆر کۆچران

(تەرجەمە) ٥ی ت١، ١٨٨٠.

مـەلا سمـایلم نـاردوه بـۆ ئـەوەی بەنـهینی وەك بەسـەرزارەکی (شـەفەهی) رام سپاردوه، دۆخی ئیرەتان بۆ رون بکاتـەوەو، بەتایبـەتی تکاتـان لیدەکـەم راستیەکانی مەسـەلەی کوردسـتان و چونـی کورەکـەم بـۆ سـابلاخ، بـه حکومـەتی ئینگلسـتان رابگەیەننو رون بکەنەوه.

گەلی کورد کە لە زیاتر لە ٥٠٠ هەزار بنەماڵە پێکهاتوە، میللەتیکی تایبەتیە. ئاینەکەیان (دیارە مەبەستی مەزەبە) لە ئاینی (ئەوانی تر) جیاوازەو، یاساو نەریتو خو ورەوشتی تایبەتیان هەیە. لەناو هەمو میللەتاندا بە نەتەوەیەکی زیان بەخشو کەللە رەق و در ناو دەبرین. بەو جۆرە باسی کوردستان کراوە. گەر یەکیك (لەناویاندا) کردەوەیەکی نارەواو ناشیرینی لیبوەشیتەوە، ناوی هەزارەها پیاو چاکو بیوەیی پیوە لەکەدار دەکرێ. بالاتان ئاشکرا بیت ئەم هەمو سیفەتە خراپانە لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانیو ئیرانیەوە بەخۆرایی بۆ کورد دروستکراون و هەلبەستراون، چونکە کوردستان لەنیوان ئەم دو دەولەتەدایەو، هەردو حکومەتەکەش ئەوەندەیان لەباردا نیە چاك و خراپ لەیەك جیا بکەنەوە. بەم جۆرە کەسە خراپەکان دەمیننەوەو خەلکە چاکەکانیش لەکەداردەبنو تیا دەچن. بیگومان لەنیو شتە دردونگەکانی تردا، ناوی خیلی عەلی ئاغای شکاکت بیستوە، کە بەکردەوەی خراپ و نارەوا ناویان دەرکردوە چۆن ئەزیەتی هاوولاتیو بیگانەیان ئەدا، بەهەمان شیوەش دەسدریژیان دەکردە سەر موسولمانان و خەلکانی تریش. هەردو دەولەتەکە ئاگایان لەکردەوە خراپەکانیان بوە. جا لەبەر گوێ پینەدان و هەولدانی ئیران بۆ قایمکردنی دەسەلاتی، ئەم خەلك و خوایە هەمیشە دور دەبن لە شارستانیەت و بەدواکەوتوییو درندەیی دەمیننەوە. کردەوە خراپەکانی خیلی هەرکی کە رەعیەتی تورکیان، دیارو ئاشکرایە. حکومەتی عوسمانی دیسان وەك ئیران یان خۆی لە پیشخستنی ئەم میللەتە گیل دەکات، وە یان بەچاویکی نزمەوە، سەیری دەکات. هەمیشە کوردستان بەخراپی ناوبراوەو بەسوکی سەیر کراوە. جیاوازی ناکریت لەنیوان خەلکانی بیوەییو شەرانیدا. سەرۆك و بەریوەبەرەکانی کوردستان، جا لە رەعیەتەکانی عوسمانی یا ئیرانیو هەر هەمو دانیشتوانی کوردستان خۆیان یەکخستوەو گەیشتونەتە ئەو بریارە کە چیتر لە توانادا نەماوە لەژیر سایەی ئەو دو دەولەتەدا بژینو، پیویستە شتێ بکەن دەولەتە ئەوروپیەکان والیبکات لە مەسەلە کە ورد ببنەوەو لە دۆخەکەمان تیبگەن و بپرسنەوە. ئیمەش میللەتیکی دابەشکراوین. ئیمە دەمانەویت بەریوەبردنی کاروباری خۆمان بەدەست خۆمانەوە بیت، بۆ ئەوەی لە سزادانی تاوانکارانی خۆماندا بەهیزو سەربەخۆ بین و، ئەو مافانەمان هەبیت کە میللەتانی تر هەیانەو؛ سەبارەت بە خەتابارەکانیش، ئیمە ئامادەین ئەوە بگرینە ئەستۆی خۆمان (بەلین ئەدەین) کە ئازارو زیان لە هیچ میللەتیك نەکەویت. ئەمەیە ئامانجی ئیمەو، هۆی چونی کورەکەم بۆ سابلاخ، بۆ ئەوەی لەدۆخی کوردستان وردبینەوەو بپرسنەوەو، هیچ خراپەیەك رونەدات، دەنا سەرتاپای کوردستان

مەسەلەکان دەخەنە دەستی خۆیانەوە، چونکە میللەت لە توانایدا نەماوە خراپەو چەوساندنەوەی بێوچانی ئەو دو دەولەتە هەلبگرێ.

## هاوپیچی ٤ی ژمارە: ٦١

**لە شیخ عوبەیدوالل‌ەوە بۆ عەباس میرزا (مولك ئاوا)**

(تەرجەمە) ٥ی ت١، ١٨٨٠.

ئەو چاکەو هەستە پاکەی کە خاوەن شکۆ شای خوالیخۆشبو لە سۆنگەی بەرژەوەندی گشتیو خیرو پیاوەتیەوە پیشانی باوکمی ئەداو، خۆشەویستیو دلسۆزی باوکی خوا لیخۆشبوشم بۆ خاوەن شکۆ، کە شەوو رۆژ باوکم بە بەردەوامیو دلسۆزانە دوعای بۆ حکومەتەکەی دەکرد، پیویستە لە هەمو شوینیك و هەمو کەسیك بیزانیت. دیسان پایەبلندی شاهانەتان باش ئاگادارە لەو دۆستایەتیەی کە لەنیوان شای خوالیخۆشبوو باوکمدا هەبو. ئیستاش، هەروەك پەندیك دەلیت "کور دەچیتەوە سەر بابی" (گیا لەسەر بنجی خۆی دەرویت) هەروەها پەندیکی تریش هەیە کە دەلیت "خۆشەویستی بەرامبەر وراثیە". ئیستا من بەش بەحالی خۆم و، وەك ئیلتیزامیکی ئەخلاقی، هەرگیز کەمتەرخەمیم لەو ئەرکە نەکردوە کە پیم سپیردراوەو، بەو پییەش پیویستە پایەبلندی شاهانەتان بەهەمان هەستی خوالیخۆشبو خاوەن شکۆوە کار بکەن و، ئەوەش بەروحیکی شاهانەوە ئەنجام بدەن، هەروەك باوکت دەیکرد، چونکە بەهەمان شیوەی سالانی رابوردو، من شاد دەبوم بەسۆزو چاکەی شای خوالیخۆشبو، لەبەر ئەوە ئیستا دلم بەلوتف و سۆزی پایە بلندی شاهانەتان خۆش دەبیت. بزانە ئەو وتەیە چەند جوانە، "کاتێ گوڵ سیس دەبێو، گولی باخچە دەوەرێ، مرۆڤ ئەتوانێ لەکوێ جوانی گولەکە بگەریت، تەنها لە گوڵاوەکە نەبیت؟

لە کۆتایدا، ئەورەحیم بەگ کە شوینی متمانەی ئیمەیە، پەیامەکانمانتان بەحەرفی پیدەگەیەنیت.

من هیچ رونکردنەوەیەکی ترم نیە.

## هاوپیچی ٥ی ژمارە: ٦١

**کورتەی خالەکانی نامەیەکی شیخ عوبەیدوالله بۆ ئیقبال الدولەی حاکمی ورمێ لە ١٥ی ئەیلول ١٨٨٠دا.**

پاش ریزو سلاو پیگەیاندن، دەلیت حاج مەلا سمایلی ناردوە بۆ ئەوەی بە شەفەوی پیوەندی بە حاکمەوە بکات. ئەو بێ ئاگانیە لە ئیلتیزاماتەکانی پیشوو،

**هەمیشە وای بۆ چوە کە  شتیکی راست بیت، ئەوەی بەبیریا دەهات بەسود بیت بۆ حکومەتی ئیران، بەراشکاوی باسی بکات، حکومەتیش سەربەست بو لەوەی بەو شیوەیەی پیی خۆش بو، بۆچونەکانی قوبوڵ بکات یا نەیکات.**

**بیگومان حکومەت ئاگادارە لەوەی کە ۵۰۰,۰۰۰ بنەمالە لە کوردستاندا  هەن، بە رەعیەتە تورك و ئیرانیەکانیشەوە.**

**لەبەر ئەوەی تا ئیستا هیچ لیکۆلینەوەو وردبونەوەیەکی جدی لەسەر دۆخی کوردستان نەکراوە، هەمیشە خەلکەکەی بە پیس ترین شیوە لەقەلەم دراون.**

**لەوانەیە کەسانی خراپ لەنیویاندا هەبێ، بەڵام بۆچی خەلکە بێ گوناحەکە لەگەڵ تاوانکارەکاندا لەیەك ریزدا دابنرین؟.**

**هۆی ئەوەی کە بۆچی گلەیی گازندە لە کوردەکان دەکریت ئەوەیە کە، حکومەتی عوسمانیو ئیرانی هیچیان نە دەسەڵاتیان هەیە نە دەخوازن بەباشیو ریکوپیکی حوکمیان بکەن.**

**کوردمان لە هەمو ئەمانەوە لەکەدار کراون و، ئەوانیش بەش بەحالی خۆیان هیچ پەیوەندیو ریزیکیان نیە بۆ فەرمانرەواکانیان.**

**بەهۆی ئەم بارو دۆخەوە، کوردەکانی ئیران و تورکیا بریاریان داوە کە یەکبگرنو دەولەتیك پیکبهینن و، لەنیو خۆیاندا نیزام بپاریزنو، بە نوسینیش بەلینی ئەوە بدەن کە هیچ هەڵاو بێ نیزامیەك لە وڵاتەکەیاندا رونەدات.**

**مەحالە بتوانرێ ئەم جوڵانەوەیەی ئیستا بەهیز دابمرکینریتەوە. خۆ ئەگەر حکومەت پەنای بۆ برد (بۆ هیز)، ئەوا دەیدۆرینن و، زیانیکی گەورەتر لە هەردو لا دەکەویت.**

**لەبەر ئەوە، شتیکی باش دەبیت کە  حکومەت ریو شوینی هیمنانە بگریت، گەر واش نەبیت، هیچ وەڵامیك نیە بۆ ئەنجامەکانی.**

**شیخ دەگاتە ئەو ئاکامەی کە بلیت، ئەو، ئەو وتارەی لای سەرەوەی بەنیازیکی پاکەوە داوەو، حاکمیش بۆی هەیە چی بەباش ئەزانیت بیکات.**

## هاوپیچی ٦ی ژمارە:٦١

**لە عەباس میرزاوە بۆ وەزیری کاروباری دەرەوە**

**(تەرجەمە)** **۳۰ی ت۱، ۱۸۸۰.**

**دریژەی (تفاصیل) مەسەلەکە وەلای ئەوەی لای خوارەوەیە:**

**دوینێ، هەینی، ۲۹ی ت۱، دو کورد کە بران و جاران خزمەتی منیان دەکرد، یەکیکیان بەناوی عەبدورەحیم (دەبیت عەبدوالرحیم  بیت) و ئەویتریان حوسین نولی،**

هاتنه ناو ماڵەکەمەوە. گوتیان، کاتێ موچەی حکومەتیان هەبوەو، لەریگەی ئایزخان سەردارەوە پییان دراوە، بەڵام ئیستا ئەو موچەیە بردراوەو، داوایان لیکردم بکەومە بەینەوەو هەولیان بۆ بدەم. پاشان، بەو بەهانەیەی (عذر- حجە) کە دەیانویست فرمانیکم پیشان بدەن، یەکیکیان نامەیەکی دەرهینا، دای بەمن و لەهەمان کاتدا بەچرپە پیی گوتم کە لە شیخ عوبەیدوڵڵاوەیە.

نامەکەم خویندەوەو، هەروەکو دەلیت عەبدورەحیم زانیاری سەرزارەکی تریشم پێ دەگەیەنێ. بانگم کردە ژوریکی تایبەتیەوە. گوتی ئەو لەلای شیخەوە نیردراوەو پەیامەکەش ئەوە بو کە هیزیکی گەورە ئامادەیەو، پیویستە چەند زو دەتوانم خیرا بکەم و بدەمە پاڵ کامپەکەی (هی شیخ)و، ئەویش بۆ ئەوە نیردراوە کە بمبات بۆ بارگەکەی.

لەبەر ئەوەی خاوەن شکۆ شا رۆحم بە قوربانی بیت! نازی بەمن داوەو پیی گەیاندوم و منیش هەرگیز ناتوانم هیچ شیوە خیانەتکاریەك بکەم، ئەو دو کوردەم گرت و تەسلیمم کرد.

## هاوپیچی ٧ی ژمارە: ٦١

### لە سوپاسالارەوە بۆ وەزیری تەلەگراف

(تەرجەمە) تەوریز، ٣٠ت١، ١٨٨٠.

(بەبروسکە)

من ئەو نامەیەم خویندەوە کە بەریز وەزیری بەریتانی ئاراستەی بەریز وەزیری کاروباری دەرەوەی کردبو و، تۆش وەك خۆی لەسەر فەرمانی شاهانە بە بروسکە بۆ منت ناردبو.

دەبیت ئیمرۆ تەیمور پاشا بەهیزیکی ١٠,٠٠٠ کەس و ٦ تۆپەوە گەیشتبیتە ورمێ. سبەینێ، هیزیکی زیادە، کە بریتیە لە فەوجیکی پیادە، ٣٠٠ سوارەو، تۆپیکی ٩ رەتلی، لەگەڵ ٥٠٠ گوللە تۆپدا، هەروەها دەردەچن بۆ ورمێ.

بیگومان، بێوچان هیزی پیادە، سوارە لەگەڵ تەقەمەنیدا بەریوەیە بۆ بارگەکەی ئیعتماد السلطنە. هەر ئیستاش پیشاندانیکی سەربازی ٣٠٠ سوارەی شا سیڤانم کرد، کە بەراستی کۆمەلیکی باش راهینراون و، سبەینێ بەیانی زو لەگەڵ کاروانیکی تەقەمەنیدا دەردەچن بۆ بارگەکەی ئیعتماد السلطنە. ئەگەر فەوجەکەی گیروس و سوارەکانی دەڤیران یش هەروەها بچنە کامپەکەی، وا بیگومان بەرەو سابلاخ دەکشێ؛ کاتیکیش حشمە الدولە دەگاتە سابلاخ، یانزیکی، ئەوسا کامپەکەی ئیعتماد السلطنەش دەرۆن بۆ ورمێ.

تکایە ئەمە بخەرە بەردەم خاوەن شکۆ شا. ئەگەر هەنگاوی تری چاك و بەسودو گونجاو تر لەوانەی من پیشانم دا دەزانیت، ئاگادارم بکەرەوە لیی‌و، منیش جی‌بەجییان دەکەم.

## ژمارە: ٦٢

لە مستەر گۆشن وە بۆ ئیرل گرانڤیل- (لە ٩ی کانونی یەکەمدا گەیشتوە)

گەورەم، ئەستەمولّ، ٢٩ی ت٢، ١٨٨٠.

گفتوگۆیەکی تری دورو دریژم لەگەلّ وەزیری دەرەوە، دەربارەی روداوەکانی کوردستان کردوە. هەروەها سەرم لەسەفیری ئیرانیش داوە، بۆ ئەوەی بەراوردی ئەو بۆچونانە (انطباعات) بکەم کە نامەکاریەکانی وەزیرەکانی ئیرە لەسەریان کردوە، لەگەلّ ئەوانەی (ئەو انطباعاتانەی) کە خۆم لەدیدارەکەم لەگەلیدا هەلم هینجاوە.

لەوە ناچیّ جەنابی عاسم پاشا هیچ جۆرە زانیاریەکی دیاریکراوی لابیت؛ چونکە هەر وەك ئەندامیکی تری وەزارەتەکە، کە رۆژی پیشوتر سەردانی کردم، گوتی زۆرترین زانیاری لەیەك نەچویان (متناقض) پیگەشتوە ئەوەندەی کە لەوان، لە تاران، یان لە شوینەکانی ترەوە هاتون و، نەشیتوانی پیم بلیت گەر شیخ عوبەیدواللە هیشتا لە ئیرانە یا گەراوەتەوە بۆ ناو خاکی تورکیا. لەلایەکی تریشەوە، سەفیری ئیران پیی راگەیاندم کە سولتان دەربارەی ئەو پەیامەی پیی راگەیاندوە کە لە شیخەوە پیی گەیشتبو و ئاراستەی خۆی کرابو، وە تیادا هاتوەکە، بەگویّ رایەلی بۆ فەرمانەکانی خاوەن شکۆ، گەراوەتەوە بۆناو سنوری تورکیا.

من سەرم سورما کە بینیم وەزیری دەرەوە تا چ رادەیەك کاری کوردەکانی تورکیا لەو بەسەرهاتانەی رویدا بەکەم دەگرت. دانی بەوەدا نە ئەنا کە شتیکی زانراو بو کە هیچ، بەلکو باندی زۆر بچوك لە سنور پەریبونەوە. ئەو رۆلەی کە شیخ عوبەیدوللە خۆی پیی هەلسا، هیشتا تەمومژ دەوری دابو؛ بەلاّم سەبارەت بە کوردەکانی، لەناو خاکی ئیراندا نیشتەجیّ بون و، یەکیکیشیان، کە عەبدوالقادر بو، ئیرانیەکان خۆیان دەسەلاّتیان پیّ بەخشیبو.

کاتیّ کە من هانی پیویستی سزادانی شیخم داو، بۆم رون کردەوە کە ئیرانیەکان بیگومان یان داوای تەسلیم بونی وەیان سزادانی دەکەن، وە یاخود گرتنی لەلایەن خۆیانەوە، بەریزی وەلاّمی دامەوە کە بابی عالی داوایەکی زۆری هەیە دژ بە ئیرانیەکان بۆ ئەو تالاّنی‌و راووروتیەی کوردەکانی ئیران دەیانکرد لە گوندەکانی تورکیاو، لەزۆر بۆنەشدا بیّهودە داوای سزادانی تاوانکارەکانیشیان کردوە. من زۆر بەتی‌بینیەکەی کەللەیی بوم وەك وەزیریکی داد، کە دەربارەی شیوازەکە گفتوگۆم

لەگــەلدا کردبــو، ئــەویش لەروانگــەی خــۆلادان لــە تــەعقیدات لەگــەڵ ئــیراندا، بەمامەلــەکردنی توندوتیــژی ســەرکردەکانی هوروژمەکــە، وەلآمیکــی وردو راســتی بەهەمان واتاو بە رستەیەکی ئاشکرا دامەوە بەوەی کە بابی عالی "حسابیکی جادی" بۆ ئەو جۆرە تاوانبارانە لەگەڵ ئیراندا دادەنیٚو، داوای سزادانی سەرۆکە کوردەکانو، رەعیەتەکانی ئیران دەکات کە تاوانیان لەسەر سنورەکانی تورکیا ئەنجام داوە.

لەبـەر ئـەوە، کـاتیك داوایــەکی رەسمــی لەلایــەن ئیرانــەوە دەکریــت، پیدەچــیٚ وەزیرەکان بریاری پەیرەوکردنی ئەم شیوازە مشت و مریان دابیت. لەدیدی خۆمەوە، هەولم دا بۆ عاسم پاشای رون بکەمەوە کە چەند خەتەرناك دەبیت گەر بەرهەلستی لەمامەلــەکردن لەگــەڵ مەســەلەکەدا بەشــیوەیەك بکریــت کــە یاســای نیودەولــەتی بیخوازیٚ، یـان اعـتراضی ناراسـتەوخۆ زیـادە بکریـت. ئـەوەی بـەریزی لەسـە رئـەوە دوپاتی کردەوە، ئەوە بو کە لیرە پیی راگەیاندوم کە پیویستە کومیسونیك دابنریت لە هەلومەرجەکان بکۆلیتەوەو شیخ دادگایی بکات.

بەم بۆنەیەوە، بەریزی هەولیکی زۆریدا کە بۆم رون بکاتەوە کە کاریکی مەحاڵ بوە بەوە باوەر بکریت کە بابی عالی لەپـەژارە بـەولاوە، لـە هیـچ روناکیـەکی تـرەوە نەیروانیوەتە ئەو بەسەرهاتانەی رویاندابو.دەبی تورکەکان چ ئامانجیکیان لەهاندان، یان چەکداریکردنی کوردەکاندا هەبیٚ؟ ئەو، ئەو بیرۆکەیەی بەلاوەنا کە یارمەتیدانی کوردەکان پیویست بـوە بۆیـان، بـۆ مامەلـەکردن لەگـەڵ ئەرمەنیـەکاندا. دانیشـتوانە موسولمانەکان، کوردەکانی لیدەرچیت، ئـەوەندە بـەهیز بـون کـە لەناوچـە ئەرمـەنی جیٚنشینەکاندا گەورەو بالآدەست بن، گەر وانەبونایە، بابی عالی ئیعتمادی دەکردە سەر لەشکرەکانی سولتان. جەنابتان دەبینیت چ جیاوازیەکی سەرنج راکیشەر لەم زمانەدا هەیە، ئەویش بەهۆی ئەو هەستەی بەجەنابتانم راگەیاند، کە، بەگویرەی باسی تر، لەناو بازنە تورکیەکاندا باوە.

من جاریکی تریش نەمتوانی بگەمە ئەوەی کە بابی عالی تا چ مەودایەك باوەری بەنیازی شیخ عوبەیدواللە هەیە بۆ دامەزراندنی کوردستانیکی سەربەخۆ. انطباعی گشـتی مـن ئـەوەبو کـە عاسـم پاشـا خـۆی بـاوەری نــەدەکرد بــەبونی جدیــی هیــچ نەخشەیەکی طموحی لەوجۆرە.

(ئیمزا) جورج جەی. گۆشن

## ژمارە: ٦٣

**لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ مستەر تۆمسن**

**بەریز، وەزارەتی دەرەوە، ٩ کانونی یەکەم، ١٨٨٠.**

**وەزیـری ولایەتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا سـەرنجی بـۆ دۆخـی میسـیونیرە ئەمریکاییـەکان و خیزانـەکانیان لـە ورمـێ راکیشـام، کـە وا پیشـان ئـەدرین توشـی دەردەسـەری بـێ بەدەسـتی دانیشـوانە ئیرانیـەکان، لـە ئـەنجامی ئـەوەی کـە بـە درۆ تاوانبار کراون بە بەشداری کردن لەگەڵ شیخ عوبەیدوڵلەی کورددا.**

**بەوپییە، ئیمرۆ بـە بروسـکە داوام لـەئیوە کـردوە، کـە ئۆفیسـە چاکـەکانتان بـۆ بەرژەوەندی ئەم خەلکانە بەکاربهینن، کە شایستەی ئەوپەری ئاورلیدانـەوەن لەلایـەن حکومەتی ئیرانەوە.**

**(ئیمزا) گرانڤیل**

## ژمارە: ٦٤

**لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(بەبروسکە، لە ١٠ کانونی یەکەمدا گەیشتوە)**

**گەورەم، تاران، ١٠ی ك١، ١٨٨٠.**

**نیشانە بە بروسکەی جەنابتان بە بەرواری دوینـێ، ئـەز شـەرەفی ئـەوەم هەیـە بە جەنابتان رابگەیەنم کە هەستی خراپ بەرامبەر بە میسیونیرە ئەمریکاییەکان لە ورمێ خولقاوە، بەهۆی بەشداریکردنیکی هەلبەستراوەوە بۆیان لەگەڵ شیخ عوبەیدوڵلەداو، بۆ چەند رۆژیکی کەمیش دوای هیرشەکەی شیخ بۆ سەر شارەکە بـەردەوام بـو، بـەڵام لەو باوەرەدام کە ئیستا بە تەواوی دامرکابیتەوە.**

**حکومەتی ئیران خەریکی ناردنی ئامۆژگاریە بە بروسکە بۆ پایەبەرز سوپاسالار، فـەرمانی پیدەکـات هـەمو ئـەو ریـو شـوینانە بگـرێ کـە دەزانـێ پیویسـتە بـۆ مسۆگەرکردنی پاراستنی میسیونیرەکان.**

**پایەبەرزی، ئیستاکە کارەکەی جیهیشتوەو لە سابلاخ رۆیشتوەو، وا چاوەروان دەکرێ سبەینێ بگاتە ورمێ.**

**(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن**

## ژمارە: ٦٥

### لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل
### (بە بروسکە لە ١١ی کانونی یەکەمدا گەیشتوە)

گەورەم، تاران، ١١ی ك١، ١٨٨٠.

هەر ئیستاکە بروسکەیەکم بە بەرواری دوینێ لە کۆنسوڵی گشتی حکومەتی خاوەن شکۆوە لە تەوریز پیگەیشتوە، پیم رادەگەیەنیت کە لەو دوا نامانەی لە میسیونیرە ئەمریکاییەکانی ورمێوە وەریگرتوە، دەلین، پەیوەندی لەنیوان خۆیانو کاربەدەستە ئیرانیە خۆجیییەکاندا دۆستانەو گەرمەو، ئەو راپۆرتە ساختانەی سەبارەت بە بەشداریکردنیان لەگەڵ شیخ عوبەیدواللەدا بەو دواییانە بلاوبوبۆوە، زۆر دامرکابونەوەو دەلێ،

مستەر ئابۆت لەسەری دەروات بەگەیشتنی ئەو بروسکەیەی لە رۆژی ١٠ی ئەم مانگەدا ئاراستەیم کردبو، لە ئەنجامی ئەو بروسکەیەی جەنابتان کە لە سەرەوە ئاماژەی بۆ کراوە، گەر هیچ راستیەك هەبوبێ لەو مەترسیە مەزعومەی بەروی میسیونیرە ئەمریکاییەکان دەبۆوە، وتی دیدەنیەکی لەگەڵ نیردراوی وەزارەتی دەرەوەی ئیرانی لە تەوریز کردوەو، ئەو فەرمانبەرەش گفتی دابویە کە راستیەکانی مەسەلەکە بگەیەنیتە پایە بلندی شاهانە، وەلیعەهدو، ئەوەشی گرتە ئەستۆ کە دەسبەجێ ئەو ئامۆژگاریانەی (تعلیمات) لایەتی بە پەیامنیری تایبەتیدا بۆ پایە بلند سوپاسالاری رەوانە بکات، کە لەوانەیە (سوپاسالار) لەم ساتەدا گەیشتبیتە ورمێ.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ٦٦

### لە ئابۆتی کونسۆلی گشتیەوە بۆ ئیرل گرانڤیل
### (لە ١٣ی کانونی یەکەمدا گەیشتوە)

گەورەم، تەوریز، ٢٣ت١، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپیچ سێ کۆپی نامە بۆ جەنابتان بنیرم، کە ئاراستەی وەزیری مفوض حکومەتی خاوەن شکۆ لە تارانم کردبو، دەربارەی کاروباری کوردەکان، خربونەوەی هیزیکی روسی لەسەر سنوری ئاراس، وە دیدەنیەکی نوێ کە بۆم رەخسابو لەگەڵ پایەبەرزی شاهانە وەلیعەهد.

ئاماژە بەهاوپیچی ژمارە:٢، لەو ساتانەوە زانیومە کە ئەو ژن و کچە نەستۆریانەی میسیونیرە ئەمریکاییەکان راپۆرتیان دابو، لەلایەن سەربازە ئیرانیەکانەوە لە گوندی ئەنهار فریندرابون، کەسوکارەکانیان دۆزیویاننەتەوە.

ئەوەندە بە تەواوی خۆیان جیاکردبۆوە کە وایان لە دۆستەکانیان کردبو تعود بکەن گیرابون.

میسیونیرەکان نامەیان بۆ من نوسیوەو ئەو هەوالەی پیشویان دەربارەی ئەم مەسەلەیە، راستکردۆتەوە.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپیچی ای ژمارە: ٦٦

**لە ئابۆت ی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆ مستەر تۆمسن**

بەریز، تەوریز، ١٩ ت٢، ١٨٨٠.

ئیمرۆ، شەرەفی ئەوەم هەبو ئەم بروسکەیەی لای خوارەوە بۆ بەریزت بنیرم:

پۆستی ورمێ گەیشت؛ لە ١٢ی ئەم مانگەدا شیخ لەگەڵ هیزەکانیدا هەلاتن. ئاماژە بە بروسکەی ١٨ی ئەم مانگە، تجاوزو خراپەکاریەکی زۆر لەئەنهارو بالۆ لەلایەن هیزە نیزامیو هاولاتیانەوە، نەك کوردەکان، کراوەتە سەر دانیشتوانە سوننیو نەستۆریەکان. بە پۆستدا دریژەکەی رەوانە دەکەم.

نیشانە بەوەی سەرەوە، هەروەها شەرەفی ئەوەم هەیە رابگەیەنم کە، بە بەرواری ١٤ی ئەم مانگە، نامەیەك لە ورمێوە بۆمن هاتوە دەلیت، سەر لەبەیانی ١٢ی ئەم مانگەدا سەیریان کردوە شیخ و هەمو هیزەکانی دیار نەماون و، بەلگەی زۆریش هەبوە کە زۆر بەپەلە رۆشتون. هەواڵ هەبوە کە شیخ سادق لە مەرگەوەر بوبێو، واش بلاوبوە کە لەشکرەکانی ورمێ بەدوی کوردەکاندا چوبن.

لەشکرە ئیرانیەکان راووروتو تالانیەکی زۆری ماڵو مولکی گوندنشینەکانیان کردوە، بە تایبەتی هی مەسیحیەکان. دیگەلەو چەندین گوندی تریش نەهامەتیەکی زۆریان بەسەرهاتوە. خەلکەکەی گۆکتەپە چون بۆ لای تەیمور پاشا خان بۆ گازەندە کردن لەسەر ئەمە. یەکیك لە قەشە پروتستانتەکان بە تەیموری گوتوە، لەشکرەکانی شیخ رەفتاریان زۆر لەمانە باشتر بو، چونکە هیچ سوکایەتیەکیان بە ژنان نەدەکرد.

لەوەتی شیخ رۆیشتوە، ئیرانیەکان دەستیان کردۆتەوە بە تالانکردنی گوندی سوننیەکان. لە ١٣و ١٤ی ئەم مانگەدا، چەندین هەزار لەهیزی نیزامیو هاوولاتیان رۆیشتن بۆ بالۆو تالانیان کردووەو، مالەکانیشیان ئاگر تیبەرداوە. وا باسدەکرێ کە ٥٠ کەس لە دانیشتوانە نیرینەکان سەربردرابیتن، هەندیکیان لەناو قەلاکەی اسماعیل ئاغادا، کە هیزیکی ئیرانی چوبو بۆ گەران بەدوای شیخدا، دۆزرابونەوە. زۆر لەکابرایەکی حاجی کرابو کە کەللەسەری کورە کوژراوەکانی بکات بەدامینی

جلەکانیەوەو بەناو کامپەکەدا بیان گیریو پیشانی خەلکی بدات. پاشان سەربازە ئیرانیەکان تەجاوزو خراپەکاری لەزیادە بەریان لە گوندی تریشدا کرد. گوندی ئەنهاری نەستۆری، کە سەروەختیك شوینی بەیەك گەیشتنی شیخ بوە لەگەڵ خەلکیدا، تالان کرا، چەندین لە دانیشتوانە نیرینەکانی بریندار بونو، هەشت ژنو کچیش بەدیل لیگیرانو بران.

کاتیك میسیونیرە ئەمریکاییەکان، لەبری مەسیحیەکانی بالۆ گازەندەیان لای تەیمور کرد، ئەمیش پاسەوانی دانا بۆ ریگەگرتن لە ئازار ئازار پیگەیاندنیان لەکاتی بەتالانبردنی شوینەکەداو، گفتیدا کە نەیەلیت هیزەکانی خراپەکاری زیاتر بکەن.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپیچی ٢ی ژمارە: ٦٦

لە ئابۆتی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆ مستەر تۆمسن

بەریز،                    تەوریز، ١٩ی ت٢، ١٨٨٠.

ئیمرۆ، ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە ئەو بروسکەیەی لای خوارەوە بۆ بەریزتان رەوانە بکەم:

"ژمارەیەکی زۆر لە قوزاقەکان گەیشتونەتە نەخچەوان؛ وا باسدەکریت کە فەوجیکی تەواوبن. دەستبەجێ بەرەو جەلفا دەرۆن. جموجولیکی زۆری لەشکر هەیە لەنیوان تفلیسو نەخچەواندا. بیستومە، کە چاوەرواندەکریت هیزیکی روسی بگاتە جەلفا."

ئامارژە بەوەی سەرەوە، ئەوەندەی من بتوانم تاوتۆی بکەم، پیدەچی روسیا تەعزیزاتی زۆر لەزەخیرەی جەنگ بۆ قارس بنیریت. ئەگەر یاخیبونی کوردەکان بە کوردستانی تورکیاو ئیرانەوە سەربکەوتایەو ئەمارەتیکیان پیکبهینایە، روسیا دوژمنیکی ئیجگار گەورەی بۆ پەیدا دەبو کە لە نزیك قارسو بایەزیدەوە بەرەنگاری بوایەتەوەو، ئامادە بو دەوروبەری ئەلیکساندر پولۆو تفلیس کاولو ویران بکات. لەبەر ئەوە، لەوانەیە حکومەتی روسیا ریوشوینی خۆپاراستن دابنیٚ بەرامبەر هەر روداویکی چاوەروان نەکراو.

وە سەبارەت بە خرکردنەوەی هیزیکی روسیش لەسەر سنوری ئاراس، ئیمرۆ زانیاریم پیگەیشتوە کە ژمارەیەکی زۆر لە قوزاقەکان گەیشتونەتە نەخچەوانو دەستبەجیٚ دەرچون بۆ جەلفاو، دەبیٚ بەخیراییش لەشکری تریان بەدوادا دیت.

ئەو كاربەدەستە ئیرانیانەی ئیرە، كە من باسی بارو دۆخەكەم بۆ كردون، سەیری مەسەلەكە دەكەن وەك وریاییو خۆپاراستنیك لەلایەن روسیاوە، كە بەگرنگی دەزانن (روسەكان) لەماوەی ئەم هەلچونەی ئیستای كوردەكاندا سنورەكەی لای ئازەربایجانەوە بێ ئامرازی بەرگری كردن نەبیت.

وەك بیستومە، سێ فەوجی سوارەی توركی گەیشتونەتە بایەزیدو، یەكیكیش لە قزل دزەیە.

دەربارەی ئەم مەسەلانە، بەردەوام دەبم لەناردنی راپۆرتدا.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپیچی ٣ی ژمارە: ٦٦

### لە ئابۆتی كۆنسۆلی گشتیەوە بۆ مستەر تۆمسن

بەریز، تەوریز، ٢٠ت٢، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە بە بەریزت رابگەیەنم كە ئیمرۆ دیدەنیەكی وەلیعەهدم كرد. باسی تاقیكردنەوەكانی ئەم دواییانەم بۆ ورمێو، گەرانەوەم لە سەفەرەكەمدا بۆ تەوریز، بۆ پایەبەرزی شاهانەی كرد.

بۆ پایەبەرزی شاهانەیم رونكردەوە، كە كاتیك من لەورمێ بوم، بەئەركی خۆمم زانیوە كە هەمو قورساییەكی نفوزم لەسەر شیخ عوبەیدوالله بەكاربهینم بۆ ئەوەی خوین رژانی ناپیویست رونەداتو، زامنی ئاسایش بۆ ژیانو ماڵو مولكی خەلكانی شەر نەكەری هەردو موسولمانو مەسیحیەكان بكەمو، لەزۆر نمونەشدا ئەو ئامانجانەم بەدەست هیناوە، ئەگەرچی مەترسیەكی زۆریش هەبوە لەسەر ژیانی خۆم.

هەروەها بەهەلم زانی كە ئاماژە بۆ ئەو بەرگریكردنە ئازایانە بكەم كە ئیقبال الدولە لە ورمێی كردو، ئەوشارەی بەرامبەر ململانیی گەورە راگرتو، پیرۆزبایی لە پایەبەرزی شاهانەشی بكەم بۆ دامركاندنەوەی شۆرشی كوردستان، بە هەست كردن لەهەمان كاتدا بەو خزمەتو سودە بەهایانەی كە سوپاسالار لەماوەی ئەم كارەی دواییدا لە تەوریز، لە مەترسیدارترین دوریاندا، كردویەتی.

پایەبەرزی شاهانەی، زۆر بەگەرمی پیشوازی لیكردمو، دیار بو زۆر بایەخی بە قسەكانم ئەدا.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## ژمارە: ٦٧

**لە ئیرل گرانڤیل بۆ مستەر St جۆن.**

**بەریز،** **وەزارەتی دەرەوە، ١٣ك ١، ١٨٨٠.**

**نامەکەی ١٦ی مانگی رابردوی مستەر گوشن م پیگەیشت، باسی گفتوگۆی بەریزی دەکات لەگەڵ عاسم پاشادا سەبارەت بە هوروژمەکەی ئیستا بۆ ناو ئیران.**

**من پیزانینی خۆم دەردەبرم بۆ ئەو شیوازەی مستەر گۆشن بەکاری هیناوە سەبارەت بەو سیاسەتەی کە تورکیا هەولئەدات لەم مەسەلەیەدا پیرەوی بکات.**

**(ئیمزا) گرانڤیل**

## ژ: ٦٨

**لە جیگری کۆنسۆل، کلایتن وە بۆ مەیجەر ترۆتەر– (لە ١٧ کانونی یەکەمدا گەیشتۆتە وەزارەتی دەرەوە)**

**هەلبژاردە،** **وان، ت٢، ١٨٨٠.**

**زانیاری دیاریکراوی زۆر، دەربارەی جوڵانەوەی کوردەکان لە ئیراندا لەبەر دەستدا نیە. دەلین، عەبدوالقادر مەراغەی گرتوەو، باندەکانیشی لەنزیك دیوارەکانی تەوریز خۆیەوە بون. بەڵام بەشی زۆری هیزەکەی، کە بۆ راوو روتو تاڵانی داویانەتە پالی، لە هۆزەکان پیکهاتون، خراپ چەکدارنو کەلوپەلو تفاقی بیٰ کەلکیان پییە، وە ئەگەر ژمارەیەکی زۆر بچوکیش لەهیزی نیزامی بەرەنگاریان ببنەوە دەستبەجیٰ بڵاوەی بۆ دەکەن.**

**واتەواتی وا بڵاو بوە کە بۆ چەند رۆژیك شیخ عوبەیدواللە خۆی لە هەندیٰ لە گوندەکانی نیوان ورمیٰو سنوردا گەمارۆ دراوەو، تا ئیمرۆش ئەوە دەبیستم کە نامە بە ئەرمەنیەکانی باشقەڵا گەیشتوە، تەئکید لەسەر ئەم هەواڵانە دەکات.**

**شیخ زۆر هەولو تەقەللای داوە کە وا لە مەسیحیەکان بکات بدەنە پالی. نەستۆریەکانی شەمدینانی ناچار کردوە کە برۆن لەگەلیداو، هەروەها ناردویتیە لای مارشەمعون گوتویەتی کە سزای شیخەکان ئەدات بۆ ئەو راوو روتیەی کردویانەو داوای یارمەتی (مارشەمعون) لیکردوە. بەو جۆرە، نزیکەی ٤٠٠ یان ٥٠٠ نەستۆریەك داویانەتە پالی، بەڵام کاتیٰ دەزانن مەسەلەکە بۆ کویٰ دەچیٰ، وتویانە، ئیمە شەرمان لەگەڵ ئیراندا نیەو گەراونەتەوە مالی خۆیان. هەروەها ئوهانس ڤارتابەدی سەرۆکی قەشەی ئەرمەنی لە باشقەڵا کە تازە گەیشتۆتە ئیرە، پیی راگەیاندم کە شیخ چەند دەعوەتنامەیەکی گەرمی بۆ ناردوە کە بیتو ببینیٰو**

لەگەلیدا دەربارەی دۆخی ولاّتەکە راویژ بکاتو چ هەنگاویش پیویستە بینین، بەلاّم بۆ خۆی داوای لیبوردنی کردوەو نەچوە.

## ژمارە: ٦٩

### لە مستەر تۆمسنوە بۆ ئیرل گرانڤیل

(لە ٢٠ی کانونی یەکەمدا، بە بروسکە وەرگیراوە)

(هەلبژاردە) تاران، ٢٠ی ك١، ١٨٨٠.

حکومەتی ئیران بە بروسکە هەوالی گەیشتنی سوپاسالار بە فەرماندەیی لەشکریك بۆ ورمیّ، پیگەیشتوە. پایەبەرزی لەسەرەتای تشرینی یەکەمدا لە تەوریز دەرچوە بۆ ئەوەی فەرماندەیی گشتی ئەو لەشکرانە بکات کە نیردراون بۆ دامرکاندنەوەی یاخیبونی کوردەکانو، لەماوەی مانگی رابوردودا سەردانی هەمو ناوچەکانی مەراغە، سابلاّخ، سولدوز کە بەم دواییانە داگیرو تالاّنکرابون لەلایەن ئەو یاخیبوانەی شیخ عوبەیدواللەو کورەکانی سەرکردایەتیان دەکردن، کردوە.

لەشکرەکەی شیخ عوبەیدواللە، ئیستا بەتەواوی بلاّوەی پیکردوەو، نیزامیش هیدی هیدی دەگەریتەوە سەرتاپای ناوچەکە.

سوپاسالار لیوەشاوەیو توانایەکی زۆری پیشانداوە لە مامەلە کردنیدا لەگەلّ ئەو سەرۆك کوردانەی کە لە شۆرشەکەدا بەشداریان کردبو. زۆربەی ئەمانە گەراونەتەوە بۆ دلسۆزیان بۆ حکومەتو، ئەو شیوازەش کە سوپاسالار بەکاری هیناوە بەسزادانی هەندیكو بەخشینی مەدالیاو دیاری بۆ هەندیکی تر، بەپیی بارودۆخەکان، بۆتە هۆی مسۆگەرکردنی ئاسایش کە لە رەفتاری باش داهاتوی هۆزەکانەوە دیتە دەستو، هەروەها لە رازیبونیان بۆ پیدانی ١٠,٠٠٠ تومان غەرامە بۆ حکومەتی ئیران وەك بژاردنیك (تعویض) بۆ تەعەداکردنەکانی رابوردویان.

بەلاّم حکومەتی ئیران کەوتۆتە مەوقفیکی گرانو ئالۆزەوە، چونکە شیخو کورەکانیو چەندین لەسەرۆکە سەرەکیەکانی شۆرشەکەی ئیران رایان کردوە بۆ تورکیاو ئیستاکە لەنزیك سنوری ئیرانەوە نیشتەجیّنو؛ مادام ریگەیان پیّ ئەدریت لەویّ بمیننەوە، ناتوانریت لەشکرەکانی ئیران لە ناوچەکانی سنور بکشینرینەوە ئەویش بەهۆی گریمانی سەرهەلدانیکی تازە، هەر ئەوەندەی کە زستان بەسەر دەچیّ.

لەو گفتوگۆو قسانەی کە سەفیری تورك لیرە کردونی، شاو وەزیرەکانی گەیشتبونە ئەو باوەرەی کە لەشکرە عوسمانیەکانی سەر سنور، یا ریگەیان لەم سەرۆکانە دەگرت کە بچنە ناو خاکی تورکیاوە، وە یان لەحالەتی چونیاندا

دەیانگرتنو؛ ڕەفتاری (تەصوفی) حکومەتی تورکیش لە پشت گوێخستنی جیبەجیکردنی ئەو گفتەی نوینەرەکەیان داویتی، لیرە انطباعیکی سەلبی دروست کردوە (خولقاندوە) هەم لەناو بازنە ڕەسمیەکانو هەم لەناو خەلکیشدا بەگشتی.

دوینێ دیدەنیەکی تایبەتیم لەگەڵ شادا هەبو، شا بە جدی دەربارەی ئەم مەسەلەیە دوا. گوتی، حکومەتی تورك سەبارەت بە سەرهەلدانی کوردەکان بەشیوازیکی دۆستانەو ئاشکرا نەجولآیەوە وەك ئەو چاوەروان بو. ئەوان (تورکەکان) گفتی هاوکاریکردنیان بە ئیران دابو، بەڵام باوەر وابوە کە لەهەندێ لایەنەوە هانی شیخیان دابیت لە فیلەکانیدا. بیگومان هیچ هەنگاویکی کاریگەریان نەنابو بۆ ریگەگرتن لِی لە چونە ناو خاکی ئیرانو دانانی خۆی بەسەرۆکی یاخیبوەکانو؛ کاتیکیش خۆیو کورەکانی لە ئاکامدا لەلایەن لەشکرەکانی ئیرانەوە تیکشکینرابون، هیچ هەولیك نەدرابو بۆ وەستاندنی پاشەکشەکردنەکەی یا ریگەگرتن لە شۆرشگیرەکان بۆ گەرانەوەیان بۆ ناو خاکی تورکیا، کە پەنا درانو لە راونانی زیاتر دەربازبون. هەروەها ریگە درابو بە چەندین سەرۆك کوردی ئیرانی کە رابکەن بۆ ناو تورکیا، لەگەڵ ئەوەشدا کە سەفیری تورك سویندو گفتی دابو کە ئەگەر شیخو کورەکانی لەئیران دەرپەرینران، دەستبەجێ بیانگرنو، ئەگەر هەمزاغاش هەروەها هەروەها لەسنور پەریەوە، بگیریتو، جا یان کاربەدەستە تورکەکان ئیعدامی بکەن بۆ ئەو تاوانانەی پیشتر لە تورکیا کردبونی، وە یان تەسلیم بە ئیران بکریتەوەو حکومەتی ئیرانی خۆی چی بە گونجاو دەبینیت بەرامبەری بیکات.

خاوەن شکۆ گوتی، ئەوە راستە کە ئەو گفتانەی بابی عالی داویتی بە سەفیری ئیرانی لە ئەستەمولٚ تارادەیەك نادیارو شوین رەزامەندی نەبون، بەڵام قسەکانی فەخری بەگ زۆر ئاشکراو رون بون.

شا دەیگوت، هەولی داوە قەناعەت بە بابی عالی بکات، داواکەی بەجێ بهینیت بۆ گواستنەوەی شیخ لە سنورو تەسلیم کردنی سەرۆکە کوردە شۆرشگیرەکانی ئیران، بەڵام ئیستا، تەنها وەڵامی نادیاری چنگ کەوتوە. بابی عالی وایدانابو کە هەڵاتوەکان چەك بکرین، بەڵام ئەمە ناگونجاو ترین ریو شوین بوە کە پیشنیار کراوە، چونکە ئەگەر شیخو کورەکانی لەنزیك سنور جێ بهیلرین، ئەوا شتیکی بەلگە نەویستە کە لەگەڵ هۆزەکانی ئەم دیوەی سنور پیلانەکانیان دەست پیدەکەنەوەو، شۆرشەکەش سەرلەنوێ لە بەهاردا دەست پیدەکاتەوە. بەگریمانی تازە بوونەوەی ئەو جۆرە شەرو شۆرە، ئیران ناتوانێ موجازەفەی ئەوە بکات، ئەو هیزە سەربازیە گەورەیەی کە ئیستا لە ورمێ کۆبۆتەوە بکیشیتەوە، وەخەرجیو بەریوەبردنی لەشکریکی ئاوها لەناوچەیەکدا کە هەمو سەرچاوەی پولو پارەی وشکی کردبو بەهۆی ئەو قاتوقریەی

که سالی پار لەو بەشەی ئیراندا بڵاوبوبۆوەو، ئەو راوروتو تاڵانیەی دواییش کە کوردەکان دەیانکرد، لاوازیو کۆسپیکی گەورە بۆ ئیران پەیدا دەکاتو، دەشبیتە سەرچاوەی نەهامەتی زیاتر بۆ دانیشتوانەکان، کە لەم کاتەدا وەرزیکی تری نەداری خراپتر لەوەی پیشو، هەرەشەی لیدەکردن.

شا لەسەری رۆیشتو گوتی، ئامۆژگاری نیردرابو بۆ سەفیرەکەی لە ئەستەمبوڵ، بۆ ئەوەی رونکردنەوەی زیاتر بۆ بابی عالی بکاتو، داوای گواستنەوەی شیخو کورەکانی لەسنوری ئیران بکات، وە هەروەها تەسلیم کردنی هەمزاغا، ئەمین ئاغا، لەگەڵ فتح الله ئاغا، کە سێ سەرۆك کوردی ئیران بونو رۆلیکی لەبەرچاویان لە یاخیبونە تازەکەدا دیوە. زۆر بەجدیەوە هیواخواز بو کە حکومەتی خاوەن شکۆ پشتگیری لەداواکەی بکات، کە بەباوەری ئەو داوایەکی نامەعقول نەبو، وە ئەوەی کە بابی عالیش هان بدریت تا بەزویی بریار بدات لەسەر ئەوەی مەبەستی بۆ بۆ بەدوکەوتن، بۆ ئەوەی ئیرانیش بەخیرایی بزانیت ئایا رازی بون بە داواکەی یان لەدواییدا رەفزکراوە. بە بۆچونی من، ئەگەر رەتکردنەوەی داواکانی ئیران دوا بریاری بابی عالی بیت، وا جۆرە هەستیك دەخولقینێ کە نارەحەتیەکی زۆر بۆ چارەسەرکردنی ململانیەکانی سنور، کە ئیستا لەنیوان دو وڵاتەکەدا بە هەلواسراوی ماوەتەوە، زیاد دەکاتو، گەرواش نەبێ ئەوە دەتوانرێ بە دانانی کۆمیسیونیك ریك بخریت بۆ بۆقلەمەکردنو بژاردنو چاککردنی ئەو زولمو گازەندانەی کە هەردولا ئیدعای دەکەن.

سەرباری ئەوەش، کاریگەری خیرای رەتکردنەوەکەیان، بیگومان دەبیتە هۆی ئەوەی کە پەیوەندیەکانی ئیران لەگەڵ روسیادا زیاتر لە هەمو کاتیك قولترو گەرمتر بیت؛ لوتکەی ئەنجامەکەشی، بەهەمو گریمانیك، لە قەناعەت پیکردنی شادا دەبیت بۆ هاوپەیمانی کردن لەگەڵ روسیادا، هەر کاتیك روودانی شەرو شۆر لەنیوان ئەو هیزەو تورکیا هەلیکی بۆ برەخسینێ بۆ تۆڵە سەندنەوە.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە ناوەرۆکی بەشیکی ئەم نامەیە بە بروسکە بۆ جەنابتان بنیرم.

## ژماره: ٧٠

**لە ئابۆت ی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٢٠ی کانونی یەکەمدا وەرگیراوە)**

**گەورەم، تەوریز، ٣٠ ت٢، ١٨٨٠.**

**ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپیچ کۆپی ئەو نامانە بۆ جەنابتان بنێرم، کە ئاراستەی وەزیری مفوض حکومەتی خاوەن شکۆم کردوە لەتاران، سەبارەت بە ناردنی لەشکری روس بۆ سنوری ئاراس‌و، ئەو شالاوەش کە سوپاسالار دژ بە کوردە یاخیبوەکان فەرماندەیی دەکات.**

**(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت**

## هاوپیچی ١ی ژمارە: ٧٠

**لە کۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وە بۆ مستەر تۆمسن**

**(هەلبژاردە) تەوریز، ٢٥ ت٢، ١٨٨٠.**

**راگەیەندراوە کە ئەو هیزە روسیەی وا چاوەروان کراوە لە شەش رۆژدا لە جەلفا بیت‌و، ٢٠٠ کەسیان گەیشتونەتە نەخچەوان، پیکهاتوە لە فەوجیکی قوزاق‌و هەندێ پارچە تۆپخانە.**

## هاوپیچی ٢ی ژمارە: ٧٠

**لە کۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وە بۆ مستەر تۆمسن**

**(هەلبژاردە) تەوریز، ٢٥ی ت٢، ١٨٨٠.**

**ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە رایبگەیەنم کە نامەیەك کە لە ١٧ی ئەم مانگەدا لە ورمێ‌وە ئاراستەی من کراوە دەلیت، دواجار تەیمور پاشا خان رۆیشتوە بەدوی شیخداو تا بەلۆی راو ناوە؛ ئیقبال الدولەش بەریگەی بیندا کەوتۆتە رێ‌و ئاغا خان سەرتیپ‌یش دوی شیخ عەبدوالقادر، کە لە مەرگەوەر سەنگەری لیدابو، کەوتوە.**

**میسیونیرە ئەمریکاییەکان نامەیان بۆ نوسیوم، گوتەکانی پیشویان سەبارەت بە گرتنی ژنە نەستۆریەکان لەلایەن سەربازە ئیرانیەکانەوە لە ئەنهار، راستکردۆتەوە، ئەوانەی (ژنەکان) وا دەردەکەوێ، بەشیوەیەکی وا چاك خۆیان شاردبۆوە، کەوا لە هاوریکانیان بکات، وابزانن گیرابون.**

**خراپەکاری‌و تەجاوزی زۆری هیزەکانی ئیران لە ورمێ‌و سابلاخ‌دا، بۆتە هۆی نارەزایی سەفیری تورك لە تاران بەرامبەر حکومەتی ئیران‌و، ئەو هاوکارە تورکەم**

نامەیەکی دەربارەی ئەو مەسـەلەیە ئاراسـتە کـردوم، منیـش هـاوپیچ کۆپیـەکت بـۆ دەنـیرم. وا دەردەکـەویت کـە حکومـەتی ئـیرانی سـەفیرەکەی دلنیـا کردبیـت کـە ئامۆژگاری فەرماندەی لەشکرەکانیان دەکەن لە شالاَوەکەدا مبادئی مرۆڤایـەتی پیرەو بکـەن. بـەریزی ئامـاژە دەکـات بـۆ گونـدە مەسـیحیەکانو موسـولمانەکانیش، بـەلاَم شـتیکی ئاشـکرایە کـە بەتایبـەتی (ممـین) لـەناوبردنی ئـەو خەلکانـەی دواوە (موسـولمانەکان) لەلایـەن سـونییەکانەوە، کـە هـاو دینیـانن، بـەجۆریك حسـابی بـۆ دەکریت کە انطباعیکی سەلبی لای بابی عالی پەیدا دەکات.

لـە هـەوالدا هـاتوە کە لەشکرەکانی ئیرانی نزیکـەی بیسـت گونـدی کوردەکانیـان لەناوچـەی چـەهریوادان ویرانکـردوەو، لـەوەش ناچـێ هیـچ دیسـپلنیکیان پـیرەو کردبیت، هەرچـەندە لـەو باوەرەدام کە لـە هـەندێ حالـەتدا دانیشـتوەکان توانیویانـە دەرباز بن، بەلاَم ترسی ئەوە هەیە کە ژمارەیەکی زۆر لەکەسانی بێ گوناح کوژرابیتن.

ئیستا من دەزانم کە گوندەکانی مەجید خـان هـەمان چارەنوسـیان هاتۆتـە رێ، بـەلاَم ئـەوەی کـە زۆریـان بـە بارمتـە لەلایـەن گلدراونەتـەوە، ئـەوە حالەتیکـە لەوانەیە فەرمانبەرە روسەکانی ناو ئیران راپۆرتی لەسەر بدەنو بیگەیەنن.

خان بابا خانی کوری مەجید خان کوژراوە. لەسەر داوای خۆی، لەشکری ئیرانی نیردرابو بۆ پاراستنی ئەو گوندەی داگیری دەکرد، بـەلاَم کـە دەبینـێ قـایم کـراوە، گـەرابۆوە بـۆ کامپەکـە. دوا بـەدوای ئـەوە، لەهـەمان گونـدەوە تەقـە کرابـو و هـەندێ سـەربازی ئـیرانی کوژرابـون، لـە ئـەنجامی ئەمـەش ئیعتمـاد السـلطنە بۆمبـارانی گوندەکەی کردو خانیشی سەربری.

ئیرانیـەکان، هـەروەها نیازیـان وایـە کیندەرگـاچ ی گوندەکـەی قـادر ئاغـاش بۆردومان بکەن. لەبەر ئەوەی مینەخانی کوری گوندەکەی قایمو پر لە چەکدار کردوە، هەمو هەولەکانیان (ئیرانیەکان) بۆ هینانەوەی سەربار بی هودە بو.

ژمارەی زۆر لەیاخیبوەکان، وە هەروەها لە خەلکانی شەرنەکەر، کە مەیال نـەبون بۆ ئیران، رایانکردوە بۆ سەردەشتو ناوچـەکانی تـری کوردسـتان کـە گەیشـتنیان ئاسان نیە، لەنزیك لەشکرەکەی ئیرانەوە.

عوسمـان ئاغـا گـەوریك کـە سـەرۆکیکی بەدەسـەلاَتە، خـۆی لـە شـۆرشـەکە بـەدور گرتـوە. لەبـەر ئـەوە پیویسـتە حکومـەتی ئیرانی بـە عەقلـەوە مامەلـەی لەگـەلدا بکـات. هەمان تیروانین بەکار دەبیت بۆ سـەرۆكو خیلـەکانی دەوروبـەری سنـەو سـەقز، کـە تـا ئیسـتا بـەبێ لایـەنیی ماونەتـەوە. رازی کـردنو راکیشـانیان دەیانکاتـە هاوپـەیمانی بەکەلك، سـەرانە وە توندوتیژیش دەیانکاتـە نـەیاری کەللـەرەق. هـەمو لیوەشـاوەییو توانایەکی سوپاسالار پیویستە بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو گیرو گرفتانەی لەدۆخەکەی

ئیستا ئالاْون؛ بەڵام بێگومان، ئاگاداری پێویستی بەهێزکردنی دادوەری دەبێت بە بەزەیی‌و دلنەرمی‌و، تێکەلنەکردنی بێ گوناح‌یش لەگەڵ گوناحباردا شێوازی کاری توندی نابەجێ لەلایەن ئێرانەوە پاڵ بەوەوە دەنێ کە لە بەهاردا یاخیبونێکی تازە وە یان جەنگێکی ئایینی لەنێوان سوننە مەزەبەکان‌و شیعەکاندا بەرپا ببێت.

لەوانەیە خراپەکاری‌و پەلاماردانی زۆرتری هێزەکانی ئێران بۆ سەر خەلکانی سوننی بێ خەتا، ئیش کردن‌و چالاکیەکانی بابی عالی سارد بکاتەوە، لەکاتێکدا ئەو هێزی ناردوە بۆ سنوری تورکیا، بۆ ئەوەی رێ لەپاشەکشەکردنی شۆرشگێرەکان بگرێت.

وا راگەیەندراوە کە تەیمور پاشا خان ١٦٠ بارە حوشتری تفەنگ‌و فیشەکی گرتوە، کە بۆ شێخ دەچو؛ وە گرتنەکەش لەناوچەی برادۆست رویداوە (بوە)و، کاروانچیەکەش گوتویەتی، ئەو ویستویەتی ئەو کەلوپەلانە بگەیەنێتە نوچی‌و بە واندا تێپەریوە.

پێشرەویی کردنی لەشکری ئێران لە بنابوە بۆ سابلاخ زۆر بە خێرایی نەئەچوە پێشەوە. شێخ عەبدوالقادر، هەمزاغا، سەرۆکەکانی زەرزی، هەمویان ئەوەندەیان کات بەدەستەوە بو کە بتوانن بەباشی لەشارەکەی دوایینەوە (مەبەستی سابلاخە) هەلبێن. لەویوە، بەو بەشە کەمەی لەشکرەکەی پێشویانەوە رۆیشتن بۆ خێوەتەکانی مەرگەوەر، هێزی زیادەیان کۆکردەوە، بە لاهیجاندا تێپەرین بۆ شنۆ، هەولی پەلاماردانێکی سنوری لای سولدوزیشیان دا، کە لەئاکامەکەیدا لەلایەن قەرەپاپاکانەوە دامرکێندرایەوە. لەکۆتاییدا، شێخ عەبدوالقادر کشایەوە بۆ مەرگەوەر شتێکی گران نیە لەوە بگەین کە بۆچی روسیا زۆر بە مەبەستەوە دەروانێتە ئەم کێشەیەی ئیستاو داهاتوی ئێرانداو، ناشتوانێت گوێ نەداتە ئەنجامی جوڵانەوەیەك کە فراوان دەبو بۆ سنورەکانی لای ئازەربایجانەوە.

## هاوپێچی ٣ی ژمارە: ٧٠

لە کۆنسوڵی گشتی، ئابۆت وە بۆ مستەر تۆمسن

بەرێز، تەورێز، ٢٩ ت٢، ١٨٨٠.

لەرێگەی هەوالەکانی دواییەوە زانیومە کە سوپاسالار ٥ فەوج، ٨ تۆپ، لەگەڵ ١٥٠٠ سوارەی بۆ مەرگەوەر ناردوە؛ ٤ فەوجیش بۆ مل پێدانی مەنگورەکان‌و ئەوەیش کەماوە لە لەشکرەکەی، کامپەکەی گواستۆتەوە بۆ سولدوز.

دانیشتوانە کوردەکانی سابلاخ کە هەڵاتبون بۆ سەردەشت‌و ناوچە شاخاویەکانی تر، لەرێگەی ئەحمەد بەگی سەرۆکی خێلی بایەزیدەوە، گەراونەتەوە مالەکانیان.

ئەحمەد بەگ هەمیشە دلسۆز بوە بۆ ئیرانو، لەگەڵ سوپاسالاریشدا رۆیشتبو بۆ سابلاخ، کە سەردار الدولە فەرمانرەوای بو.فەرمان بە بیوك قەرە پەپاك دراوە کە سەرۆکەکەی مامش کە لەسەرەتای قۆناغیکی شۆرشەکەدا لای یاخیبوەکانی گرتبو بهینیت بۆ بارگەکە، بەلام هەر زو دوای ئەوە خۆیدا بەدەستەوەو چوە لای ئیرانیەکان. لەمامەلە کردنیدا لەگەڵ سەرۆکە کوردەکاندا سوپاسالار لیوەشاوەییو توانایەکی زۆر دەخاتە رو. هەلبژاردنی ئەو بۆ عوسمان ئاغا کیورك ی سەردەشتی بۆ فەرماندەیی ئەو هیزەی کە نیردرابوە سەر هەمزاغاو مەنگوریەکان، هەنگاویکی زۆر عاقلانەیە، چونکە ئەو سەرخیلانە لەگەڵ یەکتریدا ناکۆکن. پایەبەرزی هیچ گرفتیکی نەداوە بۆ لیبوردنی شاهانە بۆ هەمزاغا، بەلام تەلمیحیکی ساکاری داوە کە ئەگەر راستگۆو دلسۆز بیت، باشتر وایە بیت بۆ کامپەکەو دلسۆزی خۆی بخاتە روو مل دانەوینێ.

لەو باوەرەدام، کە سوپاسالار، بەگەیشتنی بۆ سابلاخ، ریوشوینی بەپەلەی داناوە بۆ ریگەگرتن لە ئەنجامدانی کاری نابەجێو توندوتیژی زیاتر لەلایەن لەشکرەکانی ئیرانەوەو، ئەو ریو شوینانەش دەریان خستوە کاریگەر بون؛ وە پیش رۆیشتنیشی لە تەوریز، فەرمانی توندی ناردوە بۆ ئەو ئەفسەرانەی فەرماندەیی لەشکرەکانیان دەکرد، کە پاسەوان بۆ هەمو ئەو گوندانەی کە بیگانەکان رەهنیان کردبون دابنێو لە تەنگپیهەلچنینو نارەحەتی بیانپاریزیت. گەر وەك ئیستا تەئکید کراوە ئەو گوندانە کاولکرابیتن، پیویستە ئەم پیش بونی سوپاسالار بە فەرماندەی گشتی، رویدابیت. ئەو ئەفسەرانەیش کە ریگەیان داوە ئەو کاولکاریانە بکرینو بەردەوام بن، بەرپرسیارن لییانو، هەروەها لەپشت گوێ خستنی (تجاهل- اهمال) ئەو ئامۆژگاریانەی بەریزی دەری کردون.

شیخ عوبەیدوالله خاوەنی چەندین گوندە لەمەرگەوەرو لە بەرزاییەکانی لیواری (حافە) ئەو ریزە چیایانەدا کە سنوری نیوان تورکیاو ئیران پیکدینن. هیچ دور نیە کە بۆ ئەو لایە کشابیتەوەو، لیرەش هەوالیك بلاوە کە هیزیکی تورکی پەکی هەولیکی شیخی خستوە کە کردویەتی بۆ پەرینەوەی لەسنور.

ئیچریك بارەگای عەلی خانی سەرخیلی شکاکە، بەناراستەوخۆ لە بروسکەکەدا ئامارژەی بۆ کراوەو، دەکەویتە لای راستی دەربەندی چیاکەوە، کە سەلماس لە ورمێ جیادەکاتەوە.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## ژمارە: ٧١

**لە مستەر پلەنکیت وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٢٠ی کانونی یەکەمدا گەیشتوە)**

**گەورەم، سانت پیتەرسبورگ، ١٤ی ك١، ١٨٨٠.**

**دوینێ لەماوەی گفتوگۆیەکدا لەگەڵ M. de Giers، پرسی دوا هەواڵەکانم لیکرد سەبارەت بە کوردستان.**

**بەریزی وەڵامی دامەوە کە بەو دواییانە هیچی پینەگەیشتوە، بەڵام باوەری وابو کە شۆرشەکە دامرکینراوەتەوە.**

**منیش گوتم، لەم حالەتەدا، من وایبۆ دەچم کە سازدانی زیاتری روس لەسەر سنوری ئیران پیویست نەکات. بۆئەمە، M. de Giers تەنها ئەوەندەی وەڵام دایەوە، کە بایەخیکی زیاد لەپیویست بەو دو فەوجە دراوە کە روسیا بەراستی زانیبو بۆ نەخچەوانی بگویزیتەوە.**

**(ئیمزا) ف. ر. پلەنکیت**

## ژمارە: ٧٢

**لە کاپتن کلایتن وە بۆ مەیجەر ترۆتەر– (لە ٢٢ی کانونی یەکەمدا گەیشتۆتە وەزارەتی دەرەوە)**

**بەریز، وان، ٩ ت٢، ١٨٨٠.**

**لە ٦ی ئەم مانگەدا بروسکەیەکم بۆ سەفیر نارد، تیادا هاتبو کە شیخ عوبەیدواللە ورمێی گرتوەو، هەروەها لە ٧ی ئەم مانگەشدا بەبروسکەیەکی تر رامگەیاندبو کە لەشکرەکانی ئیران جاریکی تر دەریان پەراندوە. ئیمرۆش، سەمیح ئاغا پیی راگەیاندم کە شیخ لە راستیدا هەرگیز نەچۆتە ورمێوە، ئەگەرچی نیو سەعاتیك دور بوە لەشارەکەوەو، پاشەکشە کردنەکەش بەهۆی پیشرەویی لەشکرەکانی ئیرانەوە بوە بەڵام لەسەر ئەو داواو هاندانو ئامۆژگاریەی حکومەتی تورکیا داویتی. جیاوازی هەیە لەو بۆچونانەدا سەبارەت بەوەی کە چ هاندەریك بەشیوەیەکی سەرەکی تەئسیری لەشیخ کردوە؛ لەوانەیە نزیکی ئیرانیەکانو کەسایەتی رارایی‌و بە گومانی هیزەکانی خۆی وای لەشیخ کردبیت حەزبکات گوێ لەراویژی دۆستانەی کاربەدەستە تورکەکان بگریت. هەروەها هەوال هەیە کە عەبدوالقادریش کشابیتەوەو، دوینێ لیرە واتەواتی ئەوە هەبو کە کوژرابیت، بەڵام ئەم واتەواتە تا ئیستا تەئکید نەکراوە. بەهەر حال، بەشیوەیەکی گشتی وا دەردەکەویت کە جوڵانەوەی کوردەکان تەواو بوبێ.**

سەبارەت بەدۆخی گشتیش لەم ولایەتەدا، بە بەردەوامی هەوالی تازە دەگەیەندریت دەربارەی تالانیو رااووروتی کوردەکانو، رەوکردنیش لەهەکاریەوە هیشتا بەردەوامە. هەروەها گازندەی زۆریش هەر بەردەوامە، سەبارەت بەرەفتاری لەشکرەکان لەکشانیاندا، بەلام ئیمرۆ سەمیح پاشا دلنیای کردم کە ئەوەی لەتوانایدا بیت بیکات بۆ کۆتایی هینان بەوکارە. هەروەها گوتیشی، بەشیك لەو مامەلەکردنە خراپە، گوندنشینەکان خۆیان بەسەرخۆیاندا دینن بەهۆی ئەو کەللەرەقیو خیرا تورە بونو مەزاجە خراپەوە بەرامبەر بەلەشکرەکانو، نەویستیشیان بۆ کردنی هیچ شتیك بۆیان. ئەمەی کە من تارادەیەك ناوی دەبەم بە تصرفی وەزعیکی دیاریکراو ئەوەیە، کە من هیچ گومانیکم نیە، هەندێ جاریش پیشان دەدریت، بەلام تارادەیەکی زۆر لە ئەنجامی مامەلەکردنی خراپی پیشوو، وە هەروەها بەشیکیشی بەهۆی وەزعە نەداریەکەی (فقر) ژمارەیەکی زۆر لەگوندەکانە.

(ئمیزا) ئیمیلیەس، کلایتن

## ژمارە: ٧٣

لەسیر .ئیلیەت وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٢٧ کانونی یەکەمدا گەیشتوە)

گەورەم، ڤیینا، ٢٣ کانونی یەکەم، ١٨٨٠.

لەسەر داوای وەزیری ئیرانی، بارۆن هایمەرلی بەلینی داوە کە پشتگیری لە داوایەك بۆ بابی عالی بکات کە هەندێ لەو سەرۆکە کوردانەی لەئاژاوە تازەکاندا بەشدار بون بگیرینو نەهیلرین ئاژاوەی نوێ بنینەوە.

(ئیمزا) هیزی ئیلیەت

## ژمارە: ٧٤

لە مستەر St جۆن وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٣١کانونی یەکەمدا گەیشتوە)

گەورەم، ئەستەمولْ، ٢٢ك١، ١٨٨٠.

لەسەر داوای جەنابی موحسن پاشای سەفیری ئیران لیرە، حەز دەکەم یاداشتیك، لەگەڵ چەند هاوپیچیکدا کە زۆر بەتواناوە قوتابیە وەرگیرەکان تەرجەمەیان کردونو، لەسەر مەسەلەی ئەو هوروژمو تالانیە تازانەیە کە کوردە عوسمانیەکان لەناو ئیراندا کردویانە، بەسەرپەرشتی سەرۆك عوبەیدوالله، کە بەتیشکانیك بەدەستی لەشکریکی

ئیرانی سەر لەنوێ پەریوەتەوە بۆ ناو خاکی عوسمانی، ئەمانە وەك باسدەکریت پاش ئەنجامدانی هەمو جۆرە کاریکی درندانەو خراپەکاری.

سەفیرەکە پیی راگەیاندوم، کە بەردەوام نزیکیی ئەم سەرۆکە لە شوینی شاکارە بێ شورەییەکانیەوە، ئەگەرچی شوینی نیشتەجیشی بیت لەخاکی عوسمانیدا، شا ناچار دەکات کە هیزیکی ۳۰,۰۰۰ کەسی تەرخان بکات بۆ چاودیریکردنی سنورەکەو، وە بەهۆی ئەو نارەحەتیە مەترسیدارانەش کە روبەروی ئەم لەشکرانە دەبیتەوە لەزستانداو و لەئاو هەوایەکی لەو جۆرەدا، جەنابی وای بۆدەچیت کە هەزاران کەس لەناو بچن.

لەبەر ئەوە، جەنابی ئومیدەوارە، کە حکومەتی خاون شکۆ نفوزی خۆی بەکاربهینیت بۆ قەناعەت پیکردنی حکومەتی عوسمانی کە شیخ بگویزیتەوە بۆ مەسافەیەکی ئەوتۆ لە سنورەوە، کە شا بتوانیت لەشکرەکانی بکیشیتەوە.

(ئیمزا) ف. ر St. جۆن

## هاوپیچی ۱ی ژمارە: ۷٤

### یاداشت

### (تەرجەمە)

ئەو روداوە گرنگانەی کە لەم دواییانەدا بەتەواوی یەکیك لەناوچەکانی ئیرانی ویرانکردوەو، ئەو شیوازەش کە حکومەتی عوسمانی بە گونجاوی زانیوە پیرەوی بکات لەپیش، لەماوەی (ئاستانەی) وە پاش ئەم روداوانەدا، ئەرکی راگەیاندنی هەمو ئەم راستیانە دەخاتە سەرشانی سەفیری ئیرانی، بە نوینەرەکانی هیزە ناوبژیکەرەکان لەنیوان ئیرانو تورکیاداو، داواکردنی تەدەخولی جدی حکومەتەکانیان لەپیناوی گازندە عادلەکانی حکومەتی ئیمپراتۆری خاوەن شکۆ شادا.

بێچونە ناوەوەی دریژە زۆرەکانی ئەم مەسەلەیەوە، سەفیری ئیران شەرەفی ئەوەی هەیە، لەشیوەی مسوەدەیەکی (مخطط- مسودە) خیرادا دیارترین خالەکانی ئەم روداوانە بخاتە بەردەم قائم باللاعمالی بریتانیەوەو، کۆپی ئەو نامانەش کە بەم بۆنەیەوە ئالوگۆر کراوە لەنیوان سەفارەتی ئیمپراتۆریو بابی عالیدا، بەنامەکاریەکەیەوە بلکینیت.

نزیکەی دو ساڵ لەمەوبەر، بۆ یەکەم جار سەفیری ئیران ناچار کرا کە سەرنجی حکومەتی عوسمانی رابکیشیت بۆ رەفتاری پر هەرەشەی شیخ عوبەیدوالله، کە سەرۆك کوردیکی عوسمانیو، باش ناسراوە بەکارەریگریو جەردەییەکانی لەسەر

دانیشتوانە ئەرمەنیەکانی ئاسیا. ئەم پیاوە، کە خاوەنی کارگەیەکی گرنگی فیشەکە، تەنانەت تا ئەو ساتەوەختە، نزیکەی یەك لەشکری تەواوی لەسەر سنوری ئیرانو تورکیادا بە بەردەوامی هیشتبۆوە.

هیچ شتیك بەرامبەر ئەم هەنگاوەی سەفیری ئیرانی نەکرا؛ ئەویش نەك هەر تەنها بە ئەنقەست یان لەروی ئیهمالیەوە هیچ هەنگاویك نەنرا بۆ دورخستنەوەی مەترسیەکە، بەلکو تەنانەت مەترسیەکە لەلایەن هەمزاغاوە زیادی کردبو، کە سەرۆك کوردیکی تری ئیرانو ئازادکرابو: پەنای بردبوە تورکیاو، بەهۆی چەند تاوانیکەوە کە لەناوخاکی تورکیادا کردبوی، گیرابوو، نیردرابو بۆ ئەستەمولّ، لەویش بۆ نزیکەی پینج سالّ لەژیر چاودیری پۆلیسدا بو. ئەوەندەی نەبرد بو کە هەمزاغا ئازادکرابو کاتیك گەرایەوە بۆ ئیرانو پەیوەندی بەشیخ عوبەیدوللەوە کرد. بە تەشجیعی ئەوەی دواوە (شیخ)، هانی خیلی مەنگور، کە خۆی سەرۆکی بو، وە هەروەها خیلەکانی تری ئەو نزیکانەیدا کە شۆرش بکەن. لەبەر ئەوەی ئەم پەیوەندیانەی کوردەکان، ئیرانیەکانو، تورکەکان رۆژانە لەپیشەوە چوندا بو، نزیکەیپینج مانگ لەمەوبەر سەفیری ئیران رونکردنەوەیەکی زیاتری بۆ بابی عالی کرد، سەرنجی بۆ خر بونەوەی نزیکەی ٥٠٠٠ کورد، کە ئامادەبون پەلاماری خاکی ئیران بدەن، راکیشا.

سەفیری ئیران رەسمی ترین دلنیایی (تطمینات) لەبابی عالیوە پیگەیشت، کە ئەو کوردانەی کەلەسەر سنوری هەردو دەولەتەکە کۆبونەتەوە، بلاّوە پیدەکرین، بەلاّم هەر وەك پیشو، ئەم دلنیا پیکردنانە بە ئەنجام نەگەیەندرا.

لەم هەلو مەرجانەدا، هەمزاغا، بە بەهانەیەکی زۆر بیّ هودە ئیشارەتی شۆرشی دا، لەسنور پەریەوەو رۆیشت بۆ لای شیخ عوبەیدوللە، کە بەسەرۆکایەتی چەندین هەزار کەسەوە، کە چەکدار بون بەتفەنگی مارتینی- هینری، چاوەروانی دەکرد. هەمزاغاو دو کورەکەی شیخ عوبەیدوللە فەرماندەیی ئەم کۆمەلە کۆچەرە ناشارستانیانەیان وەرگرتو، خۆیان کرد بەناو ناوچەی ئازەربایجانداو بەشیوەیەك کە ناتوانریّ وەسف بکریت تالاّنو کاولیان کرد. نزیکەی ٦,٠٠٠ کەس بە کۆمەلّ کوژرا، پاش ئەوەی خراپترین شیوەی ئەشکەنجەو تەعەدا لیکردنیان چیشتبو: تەعەدای ناموس لەژنان کرا، مەمکیان بردرایەوە، بەشەکانی تری لەشیان پارچە پارچە کراو تیکدرا؛ پیرەمیردو منالاّن سوتینران؛ دانەویلە یا بردراوە یا لەناو برا. بەکورتی، هەمو دانیشتوانە موسولمانو مەسیحیەکان بەبیّ هیچ لیبوردنو بەزەییەك، بەدرژوارترین ئیشو ئازارەوە لەناوچون. مرۆڤ میشکی تیك دەچیت لەبەردەم ئەو هەمو خراپەکاریەدا.

لەرۆشنایی ئەو ئامۆژگاریانەی لە حکومەتەکەیەوە پیی گەیشتبو، سەفیری ئیرانی داوای لە بابی عالی کرد کە هەمو پەیوەندیەك لەنیوان عوسمانیەکانو کوردەکانی ئیراندا بوەستینیت. ئەم هەنگاوە تازەیەی سەفیری ئیرانی، هەمان چارەنوسی ئەوەکانی پیشوتری هەبو. لەراستیدا، ماوەیەکی کەم دوای ئەوە، شیخ عوبەیدوالله خۆی بەسەرۆکایەتی چەندین هەزار کەس لەسنور پەریەوەو ناوچەی ورمیّی تالانو کاولکرد.

پاشان لەشکر نیردرایە سەر ئەم هەمەجیانە؛ تیکشکاندنیان؛ هەم خیراو هەم تەواویش بو.

بەناریكو پیکترین شیوە لەسنور پەرینەوە، دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەشەرکەرەکانیان کوژران. ئینجا سەفیری ئیران داوای کرد کە ریگە نەدریت راکردوەکان بچنە ناو خاکی تورکیاوە. ئەم جارەش بابی عالی دیسان گفتیداو، گفتەکەشی بە ئەنجام نەگەیاند. شیخ عوبەیدواللەو دور کورەکەی توانیان بەکۆمەلە خەلکە کۆچەرەکانیانەوە، لەسنور بپەرنەوە. کاتیك کوردەکان چونە ناو خاکی عوسمانیەوە، گەرانەوە ناو مالەکانیان، دوای ئەوەی تالانیەکانیان بەشکردبو بەبیّ ئەوەی بەهیچ شیوەیەك تەنگیان پیّ هەلچنریت.

ئەو راستیانەی باسکران، هیچ رونکردنەوەیەکیان پیویست نیە.

ئیمرۆ، بەرپرسیاریتی زۆر دەکەویتە سەر هەم ئەو کەسانەی کە لەکاتیکدا ئەیانتوانی ریگە لەو بەدبەختیە بگرن، بەلام ریگەیان دا روبدات، وە هەم ئەو کەسانەی بە مەبەست یان لەروی ئیهمالەوە دوچاری تاوانکاران بونەتەوە، کە توندترین سزا بەس نیە بۆیان گەر بیّ سزادان بۆی دەرچن.

حکومەتی خاوەن شکۆی شا داوا دەکات کە دادوەری پیرەو بکریت؛ کە شیخ عوبەیدواللەو کورەکانی لەو ولاتانە بەدەر نرینو بدرینە مەحکەمە؛ کە کوردەکانی ئەم ناوچانە چەك بکرین؛ کە ریگە لەپەیوەندی نیوان کوردەکانی عوسمانیو ئیراندا بگیریت؛ کە ئەو کوردانەی پەنایان بردوە بۆ خاکی عوسمانی، بەپیی بەندی ٥ی دوا پەیماننامەی ئەرزرۆم تەسلیم بە حکومەتی ئیران بکرینەوە.

سەفیری ئیرانی بەباشی دەزانیت ئەوەش بلیت کە، بەهۆی ئەو زانیاریە تایبەتیانەی پیی گەیشتوە، کاربەدەستە عوسمانیەکان، دور لە دانانی ریو شوینی خۆپاراستن بۆ کۆتایی پیهینانی ئەم روداوانە، تەنانەت هانی خولقینەرەکانیشی داوەو، ئیستاش هیچ شتیك ناکەن بۆ ریگەگرتن لە دوبارە بونەوەیان. سەرباری ئەوەش، لەگەڵ گازندە یەك لەدوای یەکەکانی ئیرانیشدا، زمان حالی رۆژنامەگەریی

توركیا لەسەر ئەم مەسەلەیە، کە رای گشتی پیشان نادات، بەلکو رای بازنەکانی حکومەت دەخاتەرو، بەشیوەیەکی کافی تەئکید لەم زانیاریە دەکات.

## هاوپیچی ٢ی ژمارە: ٧٤

نامەیەك لەبابی عالیەوە بۆ سەفارەتی ئیرانی، لە ٢٥ی تشرینی دوەمی ١٨٨٠دا. (تەرجەمە)

لەدوا نامەمدا بۆ بەریزتان، رونم کردەوە کە هۆزە ئیرانیەکان لە قازاو کوڤاردا بەنیازی خراپەوە یەکیان گرتوەو، لەلایەن فەرمانبەرە ئیرانیەکانەوە هاندراونو، لەهەوالیشدا هاتوە کە پر چەکیان کردون.

ئیستا، نامەکەی بەریزتان بە بەرواری ١٦ی تشرینی یەکەم وەرگرت، کە تیایدا وەڵام دەدەیتەوە بەوەی کە هیچ جۆرە بنچینەیەك نیە بۆ تەئکید لەسەر ئەوەی کە فەرمانبەرە ئیرانیەکان چەکیان بەو خیڵانەی لای سەرەوە باسکراون، دابیتەوەو، بەپیچەوانەوەشەوە، هەمو تەگبیریکی خۆپاراستن کراوە بۆ ریگەگرتن لەو جۆرە رەفتارە ناقانونیە. سەرباری ئەوەش، بەریزتان تەئکید لەسەر ئەوە دەکەن کە هەمزاغا، کە پەنای بردوە بۆ ناو خاکی توركیا، لایەنگریکی شیخ عوبەیدوڵلایەو، دوای کۆکردنەوەی چەند هەزار کەسیك بۆ مەبەستی راوروتو تاڵانی، ئیستا خەریکی تاڵانکردنی ناوچەی ساببڵاخە؛ ئەو راستیەش کەکورو کورەزاکانی شیخ عوبەیدوڵلە خەریکی ئەم ئاژاوانەن، بەلگەیەکە کە عوبەیدوڵلە خۆی بەشدارە لەگەلیانداو، گەر ئیمە ریو شوین دانەنین بۆ تیکشکاندنی ئەم یاخیبونە، ئەوسا بەرپرسیاریەکە دەکەویتە سەر ئەوانەی کە بەهۆیانەوە پەیدا بوە. لەبەر ئەوەی کە بەریزتان لە پەنجەرەیەکی جیاواز لەوەی ئیمە دەروانننە یاخیبونەکەی هەمزاغاو، بۆ ئەوەش دەخوازن بەرپرسیاریەکە بخەنە سەر خەلکی تر، بەئەرکی خۆمی دەزانم چەند رونکردنەوەیەك لەسەر مەسەلەکە بکەم. ماوەیەکی زۆر نابیت لەمەوبەر کە ئەو هەمزاغایەی لەسەرەوە باسکرا، دوای ئەوەی کاربەدەستە عوسمانیەکان بۆ ماوەیەك لەسەر کاری ناقانونی کە لەناوچەی کەرکوكدا کردبوی، دەیگرن، پاش ئەوە بە مەرجی نیشتەجێ بون لە موسڵدا، ئازادی دەکەنو، لەویشەوە هەلدێ بۆ ساببڵاخو، کاربەدەستە ئیرانیەکانیش مامەلەی باش دەکەنو، بەرگیکی شەرەفی پێ ئەبەخشنو، دەیکەن بەسەرۆکی ئەو هۆزانەی لەسەرەوە باسکرانو، تا ئەم ساتەش هەر لە ئیران نیشتەجێیەو، ئیستاش بەیداخی شۆرشی بەرز کردۆتەوە. سەبارەت بە عەبدوالقادری کورەکەی شیخ عوبەیدوڵلەش، چەند سالیکی کەم لەمەوبەر، خاکی توركیای جیهیشتوەو لەئیران نیشتەجێ بوەو، لەو ساوە داویتیە پاڵ

شۆڕشـگێرەکان. بـەڕێزتان تـەئکید لەسـەر ئـەوە دەکــەن کــە هــەندێ لــە دانیشــتوە کوردەکـانی خـاکی عوسمـانی، لەگـەڵ ئەوانـەی لــەژێر سـەرکردایەتیی هــەمزاغادان یـەکیان گرتـوە. ئیسـتا حکومــەتی ئیمـپراتۆری خـاوەن شـکۆی سـولتان ئـەوەندە بەپەرۆشـە کـە بەرژەوەندیـەکانی ئیسـلام بپـارێزێت و، لەهـەمان کاتیشـکدا ئاگـاداری ئەوانە بکات (رعایە) کە دەولەتێکی سنور هاوبەشو دۆستانەن، هەرگیز بۆ ساتێکیش رێگەی نەداوە هیچ هاندانێك بۆ جوڵانەوەیەکی شۆڕشگێرانە بکرێت.

بەو پێیە، بەهۆی سەرهەلدانی یاخیبونەکەی ئێستاوە، بەپەلـە فـەرمان درابـو بـۆ زیـادکردنی ئـەو هـێزە سـەربازیانەی لەسـەر سـنوری هــەردو دەولەتەکــە دانرابــون، بەتایبـەتی لـەلای رەوانـدز، هـەکاری، کۆڤـارو واندا، وە تەنـها نـەك هــەر رێگــە لــە کوردەکـانی تورکیـا گـیرابو کـه بدەنــه پــاڵ ئەوانــەی ئـێران، بــەلکو لەرێگــەی سەرۆکەکانەوە، کە ئامۆژگاری بۆ بەنفوز ترینیان ناردبو، زۆر لـەو خێلانـەی لـە زەویـە پر لەوەرگاکانی خاکی ئێراندا نیشتەجێن و، لەگەڵ ئەوەشدا بە بنچینە عوسمانین، رازی کرابون لە سنورەکان بپەڕنەوەو بگەڕێنەوە ناو خاکی تورکیا. بەم هەنگاوانە، ئیمـە بەلگـەی دۆسـتایەتیمان بەدەولـەتی ئـێران داوەو، ئـەو پەیوەندیانـەمان بــەهێز کردوە کە دو وڵاتەکە بەیەکەوە هاوکاری بکەن. لەبەر ئـەوە، کاتـێ دەبینـین کـوردە عوسمانیـەکان بەشـداریان لـەم شۆڕشـەدا نـەکردوە، حکومــەتی عوسمــانی بەهــەمو شـێوەیەك تەقـەللای داوە ئاژاوەکـە دابمرکێنــێ، نـاتوانرێت عوبەیدوالله بەرپرسـیار بکرێت بۆ ئەو شۆڕشەی کورەکەی لە ئێراندا بەرپای کردوە، چونکە هیچ بەلگەیەك نیـە کـە جوڵاندنەوەکـەی ئـەم دو سـەرۆکە بەیەکـەوە گرێـدراون، سـەرباری ئـەوەش، دەبینین حکومەتی عوسمانی لە ئاستێکدا نەبوە بتوانێ رێگە لەخێلە عوسمانیەکانی دانیشتوی زەویە پر لە وەرگاکانی ناو خودی خاکی ئێراندا بگرێت لە بەشداربونیان لە شۆڕشەکەدا، گەر لەراستیدا وایان کردبێت. (بەشداریان کردبێـت). دەخـوازم بـە بـەڕێزت رابگەیـەنم کـە دلسـۆزانە پـەژارەی خـۆم دەربڕم بــەوەی کـە نەئەبوایـە بەرپرسـیاریتی بخرایەتـە ئەسـتۆی دەولـەتێك کـە هەمیشـە گـەورەترین حەماسـەتی پیشـان داوە بـۆ ئـەم بـە ئەنجامگـەیاندنی ئەرکـەکانی بەرامبـەر ئـێران وەك وڵاتێکـی هاوسنورو دۆست، بەرپرسیاریەك کە قبوڵ کردنی بەتەواوی رەت دەکەینەوە.

## هاوپێچی ٣ی ژمارە: ٧٤

نامەیەك لەسەفارەتی ئێرانیەوە نێردراوە بۆ بابی عالی، ١٥ی تشرینی دوەم، ١٨٨٠ (١٢ی زی الحجە، ١٢٩٧) (تەرجەمە)

سەفارەتی ئیرانی لەوەڵامی نامەکاریەکانیدا، گەیشتنی نامەیەك بەبەرواری ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٨٨٠ (٢١ زوالحجە، ١٢٩٧) دا رادەگەیەنیت، کە هەمزاغا، دوای زنجیرەیەك تالانی نارەوا لەئیراندا، هەلاتبو بۆ ئەو دیو سنوری تورکیاو، لەویش دوای تجنید کردنی هەندێ لەلایەنگرەکانی شیخ عوبەیدوللەو چەند هەزار کوردیکی ناوچەکە، گەرابۆوەو، پالی دابوە شۆرشی کوردەکان لەئیرانو چەندین کاری توندو تیژیو داپلۆسینی دژ بە رەعیەتە دلسۆزەکانی سنجقی سابلاخ ئەنجام داوە؛ سەرباری ئەوەش، کورو کورەزاکەی شیخ لەگەڵ هەمزاغادا بونو، زانیاری باوەرپیکراو هەبو سەبارەت بە بەشداریکردنی شیخ لە یاخیبونەکەدا.

بابی عالی، لەوەڵامەکەیدا رونی دەکاتەوە کە، بێ گویدانە مافە نیو دەولەتیو پەیماننامەکان، سەبارەت بەیەکبونی رەگەزو نزیکیی خاکەوە، ئامۆژگاری پیویستیدابو بە فەرمانبەرەکانی کە ریگە لەهاوکاریکردنی کوردەکانی تورکیاو بلاوبونەوەی یاخیبونەکە بگرن؛ هەروەها دۆستایەتی خۆی پیشانی حکومەتی ئیرانی دابو، بەناردنی هیزی تازە بۆ هەموو مەخفەرە گرنگەکانی سەر سنور، بەتایبەتی بۆناو ناوچەکانی رەواندز، هەکاری، کوڤارو، وان؛ بەو جۆرە، ئەوەندەی توانرابو، هەمو ئەو ریگەی پەیوەندیانەی نەهیشتبو، کە بە هۆیەوە کوردەکانی تورکیا ئەیاندایە پاڵ یاخیبوەکان، بەلام نەیتوانی شیخ عوبەیدوللە بەرپرسیار بکات بەرامبەر کردارەکانی کورەکەی، وە یان بەشداربویەك لەیاخیبونەکەی کورەکەیدا لەو دیو سنورەوە.

سەفارەتی ئیرانی سوپاسو پیزانینی خۆی پیشکەش بەبابی عالی دەکات بۆ ئەو ئیجارائاتە دۆستانەیەی لەبری کراوە. سەرەرای ئەوەش، لەسەرچاوەی باوەرپیکراوەوە بیستویەتی کە کوردەکانی تورکیا خیڵ بەدوای خیڵدا، بەم دواییانە لەسنور پەریونەتەوە، کەلوپەلو تفاقی سەربازیان بۆ یاخیبوەکان گواستۆتەوە بۆ ناو ئیرانو، بەهەمو شیوەیەكو بەئاشکرا یارمەتیان داون؛ شیخ عوبەیدوللە خۆیشی، بەهیزیکی گەورەوە پەریوەتەوەو، کاری هەمە جیانەی لە ورمێو ناوچەکانی نزیکیدا ئەنجام داوە؛ لەگەڵ وریابونو ئاگاداریکردنی بابی عالیشدا، ریگە لە کوردەکانی تورکیا بەهیچ شیوەیەك نەگیراوە کە هەمو جۆرە یارمەتیەك بە شۆرشگیرەکان بگەیەنن، ریگەی پەیوەندیەکانیشیان لی نەگیراوە بەهۆی گوێ پێنەدانی فەرمانبەرە تورکەکانی سەر سنورەوە؛ ئەمەیش شیوازیکە کە زۆر زەرەرمەند دەبیت بۆ بەرژەوەندیەکانی ئیسلامو هەردو ئیمپراتۆریەتەکەو، کە ناشتوانریت لەلایەن حکومەتی ئیرانەوە قبوڵ بکریت.

سەفارەتی ئیرانی زۆر بەداخە کە دەبینێ بابی عالی بەردەوامە لەسەر پشت گوێ خستنی بەشداركردنی شیخ، ئەگەرچی سەفارەتی ئیرانی ژمارەیەکی زۆر دۆکیومینتی بەدەستوخەتی شیخ لەلایەن دەیسەلمینن کە ئەو (شیخ) هۆی راستەقینەی شۆرشەکەیە؛ لەماوەی ئەو دو سالەی دواییدا، زانیاری سەرزارەکیو نوسراو بە بابی عالی دراوە سەبارەت بەوەی کە شیخ لەماوەی سێ سالی رابوردودا تۆوی یاخیبونی چاندوە.

دەرئەنجام، سەفارەتی ئیرانی دەخوازێ ئەوە رونبکاتەوە کە ئەگەر بەهۆی بەشداریکردنی لە هوروژمەکە بۆ ناوخاکی ئیرانو لەبەشداریکردنی لە شۆرشەکەدا گوشار بخریتە سەر شیخ، شتیکی ئاشکرایە کە سەر لەنوێ خۆی دەکاتەوە بەناو خاکی تورکیادا؛ خۆ ئەگەر ریگەی پیبدرێ بەبێ هیچ کۆسپیك بپەریتەوەو تەسلیم بە فەرمانبەرە ئیرانیەکان نەکریتەوە، وە بەپیچەوانەشەوە، پیشوازی باشی لیبکریتو تەنانەت بخریتە ژیر سایەو پاراستنی ئیمپراتۆریەتەوە، ئەوا ئەو شیوازە پیچەوانەی دۆستایەتی تەواو و نیەت پاکی دەبیت کە لەنیوان دو ولاتدا هەن؛ خەلكو مالو مولکیکی زۆر لەدەست دەچنو؛ دەبیت بەرپرسیاریتی دەرئەنجامی وا خراپ بخریتە ئەستۆی ئەوانەی کە بە شیوەیەیەکی ئاشکرا سەبەب کاری بون.

## هاوپیچی ٤ی ژمارە: ٧٤

**نامەیەك کە لە بابی عالیوە بۆ سەفارەتی ئیرانی نیردراوە،**
**٢٨ی تشرینی دوەم، ١٨٨٠.**
**(٢٥ی زی الحجە، ١٢٩٧)**

(تەرجەمە)

بابی عالی بە پەژارەوە ئەو نامەیەی بەرواری ١٥ی ت١، ١٨٨٠ (١٢زی الحجەی، ١٢٩٧) کە لە سەفارەتی ئیرانیەوە پیی گەیشتوە، خویندەوە، لەوەلامی نامەکەی خۆیدا، کە ئەو ئیجرائاتە دۆستانانەی رونکردبۆوە کە حکومەتی تورکیا لەسەر سنور کردبونی، لەگەل جیاکردنەوەی خیلەکانی تورکیا لە کوردەکانی ئیران. (دیارە مەبەستی خیلە کوردەکانە، وەرگیر)

پیویستە سەفارەتی ئیرانی لەوە باش ئاگاداربیت کە حکومەتی تورکیا، وەك شیوازیکی دۆستانە، هەمو ئەوەی لەتوانایدا بوە کردویەتی بۆ دامرکاندنەوەی شۆرشەکە، هەم بە پاسەوانکردنی سنورەکەو هەم لە پیش وەخت گیراندنەوەی ئەو خیلە تورکیانەی کە لەهاویندا لەبەرزاییەکانی ئیراندا دادەنیشن.

بەهۆی ئەم ریو شوینە کاریگەرانەوە، یاخیبوەکان نەیانتوانیوە ژمارەکانیان زیادکەن؛ دوبەرەکیو کیشە لەنیوانیاندا پەیدا بوەو، جموجولی لەشکرەکانی ئیرانیش ئاسان بوە.

بە لە بەرچاوگرتنی ئەم راستیە خراپانە (بەدناوانە) کە بەباشی سەلمیندراون، بابی عالی بەسەرسورمانو داخەوە دەنواریتە ئەوەی کە سەفارەتی ئیرانی لەنامەکەیدا حکومەتی تورکیا بەرپرسیار دەکات بەرامبەر بە هوروژم بۆناو ئیران لەلایەن کوردەکانی تورکیاوە، بۆ یارمەتی کە تورکیا دابیتی بە یاخیبوەکان، وە بۆ ئەو خۆ گیل کردنەی فەرمانبەرە سیڤیلو سەربازیەکانی لەسەر سنور.

لەو ئیجرائاتانەی کراون، حکومەتی تورکیا تەنها دۆستایەتی دلسۆزانەو هەستی پاك هاندەری بون بەرامبەر حکومەتی ئیرانی. ئەم ئیجرائاتانەش یاریدەدەریکی مادیی بون بۆ دامرکاندنی شۆرشەکەو، زیاتریش لەوە رەزامەندیو پیزانینی حکومەتی ئیرانی پیشانداوە؛ لەبەر ئەوە، شوینی سەرسورمانەکە کە سەفارەتی ئیرانی لەنامەکەیدا بەرامبەر وەستاوەو تەئکید لەسەر پیچەوانەی ئەو شتە دەکات.

ناتوانریت شیخ عوبەیدوللە بەرپرسیار بکریت لە یاخیبونەکە چونکە گەر بیلایانانە لە مەسەلەکە بکۆلدریتەوە، دەردەکەویت کە هۆ سەرەکیەکان ئەو توندوتیژییە کە بەرامبەر هەمزاغا پیشان دراوەو ئە و چەوساندنەوەی چەند خەلکانیك لەلایەن کاربەدەستە ئازەربایجانیەکانەوە، وە هەروەها ئە و راوو روتو تالانیە هەمیشەییەی کە خیلەکانی سەر سنوری ئیران دەیکەن.

بەو جۆرە، هەر ئەوەندەی پالْ بە هەمزاغاوە نرا بۆ یاخیبون، لەسەر داوای حکومەتی تورکی شیخ لەمەیدانی شەر کشایەوە، کەچی خیلە ئیرانیەکان هەر بەردەوام بون لەسەر پەلامارداނو ئەوەیش خەلکی ناوچەکەی هاندا تۆلە بکەنەوە.

ئەنجامی باشی ئەو ئیجرائاتانەی حکومەتی تورکیا کردبونی، ئەوکاتە ئاشکرا بونو، بیجگە لەو کەسانەی کە لە بەرزاییەکانی ئیراندا مابونەوە، یەك خیلی تورکی لەهیچ کاتیك وە یان لەهیچ شوینیکدا نەیانداوەتە پالْ یاخیبوەکان.

بەهەر حالْ، شتیکی پیویستە کە حکومەتی ئیرانی وەلامی هەولی دۆستانە بداتەوە وەك ئەوەی تورکیا لەو دیو سنوری خۆی کردویەتی. ئە وە راستیەکی پر داخو پەژارەیە کە خیلەکانی ئیرانی بەردەوامن لە جەردەییو تالانی لە ولایەتەکانی بەغدا، موسلْو، واندا. پیدەچیٚ ئەو نامە یەك لەدوای یەکانەی بابی عالی ناردونی بیٚ هودەبن (غیر مجدی)و، تالانچییەکانیش تەواو سەربەستیان لەخاکی ئیراندا هەبیٚ.

بەو جۆرە ، لەو دریژەیەی پیشکەش کرا، دەبینریت کە، لەکاتیکدا حکومەتی تورکی هەمو تەقەللایەکی داوە بۆ پاراستنی بەرژە وەندیەکانی ئیران، بناغەیەکی

چاكی هەیە بۆ گازندەكردن بۆ ئەو زەرەرو زیانو ئازارانەی بەدەستی خێلە ئێرانیەكان دوچاری خەلكی توركیا بۆتەوە.

لەبەر ئەوە، بابی عالی ئە و بەرپرسیاریەتیە رەفز دەكات كە پیدەچی سەفارەتی ئیرانی بخوازێ بیخاتە ئەستۆی.

## هاوپیچی ٥ی ژمارە: ٧٤

نامەیەكی سەفارەتی ئیرانی بۆ بابی عالی، ٥ی كانونی دوەمی ١٨٨٠.

(تەرجەمە)

بەداخیكی زۆرەوە، دوانامەتان بە بەرواری ٢٨ تشرینی یەكەمی ١٨٨٠، لە وەلامی نامەكەی پیشوماندا وەرگرت. لەو نامەیەدا پیمان راگەیاندبون كە شیخ عوبەیدوالله، لە سێ ساڵ لەوەبەرەوە هانی كوردەكانی ئیران ئەدات بۆ شۆرشو، بەباشترین بەلگەو نامەی نوسراو بەدەستی خۆی سەلماندویەتی كە بزوینەری فتنەو یاخیبونە، بەم دواییانە لەگەڵ هیزیكی گەورەدا پەریوەتەوە بۆ ئەم دیو سنوری ئیمەو خۆیشی بەشداری لەكارە نارەواكاندا كردوە. ئیمە هەروەها پیمان راگەیاندن كە خێلە كوردە عوسمانیەكان، یەك لەدوای یەك، بە پیشیلكردنی هەمو پەیماننامەو ریكەوتنیك لە سنور پەریونەتەوەو، بەئاشكرا یارمەتی یاخیبوەكانیان داوە بۆ گواستنەوەی تەقەمەنیو كەلو پەلو پیویستی تردا. ئیمە گوتمان كە، لەبەر ئەوەی سوپای عوسمانیو فەرمانبەرە سیڤیلەكانی سەر سنور بەهیچ شیوەیەك ریگە لەم كارانە ناگرن، وا ئاكامە خەمناكەكانی دەكەویتە ئەستۆی ئەو كەسانەی كە هانیان داون یاخیبن.

لەوەلامەكەتاندا، تێبینی دەكەین دەلین، هەرچەندە حكومەتی ئیرانی رەزامەندی دەردەبرێ بۆ ئە و هەنگاوانەی كە حكومەتی عوسمانی ناویتی بۆ پاسەوانی كردنی سنورەكەو، ریگەگرتن لە خێلە كوردە جۆراو جۆرەكانی عوسمانی كە نەدەنە پاڵ شۆرشەكە، كەچی هیشتا ئیمە (سەفارەتی ئیران لە ئەستەمولّ) هەمیشە تیروانینیكی پیچە وانەمان هەبوە بۆ مەسەلەكە. ئیوە دەلین، لەسەر ئامۆژگاری حكومەتی توركیا، عوبەیدوالله لە مەیدانی شۆرشەكە كشاوەتەوەو، برینی بەردەوامی سنور لەلایەن هۆزە ئیرانیەكانەوە، رۆحی تۆلەسەندنەوەی لەناو دانیشتوانە توركەكاندا بەرزكردۆتەوە؛ دیسان، ئەوەی كە ویرای ئەو خیلانەی ئیستا لە مەیدانەكەدان، هیچ خیلیكی عوسمانی تر هەرگیز نەیداوەتە پاڵ یاخیبوەكان؛ بەو جۆرە خواستی خۆتان پیشان ئەدەن بۆ دەربازبون لە بەرپرسیاریتی. زۆر لامان سەیرە، دەبێ بۆچونی ئیمە لە چ بەشیكی مەسەلەكە جیاواز بوبێ لەوەی حكومەتەكەمان. یەكە م شت، ئیمە سوپاسمان كردن، هەم لەلایەن جیگیرەكەمان. وە هەم خۆم بەشەخسی بۆ ئەو

دلنیاییکردنانه کە ئیوە داتان بە ئیمە بۆ پاسەوانی کردنی خالە گرنگەکانی سەر سنور. زۆر بەداخەوە دەلیین کە ئەو ئیجرائاتەی ئیوە کردتان هیچ جۆرە کاریگەریەکی نەبو، چونکە ریگەیان لەهیچ کەسیك نەگرت کە لە سنور دەپەریەوەو، هەمو ئەو کەسانەش کە تا ئیستا نەپەریونەتەوە، خەریکن دەپەرنەوە.

دوەم شت، سەبارەت بەعوبەیدوالله کە لە مەسەلەکەوە گلاوە، هەرچەندە ئیمە زۆر جار ئاگاداری ئیوەمان کردوە کە ئەو (شیخ) هۆی هەمو ئاژاوەکانو هاندەری شۆرشە، بەلام ئیوە هەمیشە هەولتان داوە خۆشناوی بکەنو، سوربن لەسەر وتنی ئەوەی کە هیچ پەیوەندیەکی بەیاخیبونەکەوە نەبوە. بەلام ئیستا هەرچۆنیك بیت، بەسە کە ریگا ئەدەنو دان بە وە دا دەنین کە لە سنور پەریوەتەوەو جاریکی تریش گەراوەتەوە.

بەهەرحال مەسەلەکە تەواو بە تیشکیکی جیاواز پیشان ئەدریت. راستەکەش ئەوەیە، کە لەسەر ئامۆژگاری حکومەتی عوسمانی نەبو، کە یاخیبوەکان لە مەیدانەکە کشانەوە. حکومەتی ئیرانی، کە دەیبینی ژمارەی یاخیبوەکان رۆژ بە رۆژ لە زیادبوندایە، کەوتە ئامۆژگاریکردنیان تا بلاوەی پیبکەن؛ بەلام بەهۆی ئەوەی کە ئەمانە (کوردەکان) ئەو جۆرە پیاوانە نەبون کە ئامۆژگاری قوبول بکەنو، ئەم روداوە دل تەزینو پر مەینەتیە بەدوای یەکانەدا، بوە شتیکی پیویست کە زەبروزەنگ بەکاربهینن بۆ سزادانیان. بەو پییە، یاخیبوەکان نەیانتوانی بەرگری هیرشەکانی سەربازەکانمان بەسەرپەرشتی شای مەلیکمانو، عوبەیدوالالەش خۆی گوشاری خرابوە سەرو خەریك بو بگیریت، بەلام بەهەرچی ریگەیەك بێ، دەربازبو. ئیمە راماوین، ئایا ئەمە ئەو مەسەلەیەیە، کە وەك ئیوە دەلین، تیروانینمان جیاوازی هەیە تیایدا لەگەل ئەوەکەی حکومەتەکەدا؟

سیهەم شتیش ئەوەیە کە، جگە لە وانەی کە لەمیرگەکانی ئیراندا مابونەوە، ئیوە دەتانگوت، هەرگیز هیچ خیلیکی عوسمانی بەکۆمەل نەیانداوەتە پال یاخیبونەکە. هیچ پیویستی بە سەرسورمان ناکات گەر بە تاکەکەسی بیاندایەتە پال یاخیبونەکە. بەلام ئایا ئەو خیلانەی کە بە هەزاران لەگەل شیخدا پەرینەوە ئەو دیو، ئەگەر عوسمانی نەبون، چی بون؟ کەواتە، لەبەر ئەوەی حکومەتی ئیرانی ناتوانێ قوبولی ئەو پاراستنە بکات کە دراوە بەم عوبەیدوالالەیە، کە ١٥,٠٠٠ کەسیکی بەدبەختی کوشتوەو گوندەکانیشی کاولکردون، دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی دوپاتی بکەینەوە کە، ئەگەر سزا نەدریت بە دورخستنەوەیان حەپس کردنی هەتا هەتایە، وا بەرپرسیاریتی ئەو ئاکامانە (عواقب) دەکەویتە ئەستۆی ئەو کەسانەی کە ببونە هۆی.

## هاوپێچی ٦ی ژمارە: ٧٤

**نامەیەك لەبابی عالیوە بۆ سەفارەتی ئێرانی، ٢٩ تشرینی دوەمی ١٨٨٠ (٢٦ی زی الحجە ١٢٩٧)و ١٨ی تشرینی دوەمی ١٨٧٩ (١٢٩٦)**

**(تەرجەمە)**

**بابی عالی گەیشتنی نامەکەی سەفارەتی ئێرانی دەگەیەنیت، کە تیایدا داواکراوە سزای ئەو سەرۆکانە بدرین کە لەشکرەکانی ئێران دەریان دەپەرینن بۆ ئەو دیو سنوری تورکیا، وە لە وەڵامدا دەخوازیت ئەوە بخاتەرو کە پیویستە ئەو پەناهەندانە وەك کەسانیك دابنریت کە داوای پەناهەندەیی دەکەن لەژیر حمایەی حکومەتی تورکیاداو، کاتیك کە چەکەکانیان لی وەرگیرا، ئەوسا دەبیتە شتیکی سروشتی کە وەربگیرین. سەرباری ئەوەش، لەوان وە بەبابی عالی راگەیەندراوە کە حکومەتی ئیرانی سەرکەوتنەکەی بەجۆریکی وا نهینی بەکارهیناوە کە، بەهۆی کۆمەڵ کوژیەکەی بەشیك لە دانیشتوانی ورمێ، نزیکەی ٦٠,٠٠٠ یا ٧٠,٠٠٠ کەس کۆچیان کردوە بۆ ناو تورکیاو، ٢٠٠٠ کەسیکیش لەمانە هاتون بۆ هەکاری.**

**سەرنجی حکومەتی ئیرانی بۆ ئەو راستیە رادەکیشیت کە باشترین ریگەی گیرانەوەی ئاشتیو ئارامی ئەوەیە کە رازی بیت بە بەرهەمەکانی سەرکەوتنەکەی، ئەو ریگەیەی کە لە هەمان کاتدا لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی خودی خۆیدا ریکدەکەویت. ئەنجامی سوربون لەسەر ریو شوینی توندوتیژ، تەنها ئەوە دەبێ کە خەلکانی ئیرانی بە کۆمەڵ دەرژینە ناو خاکی عوسمانیەوەو، لەویش ناچار دەبن پارەو دراویکی زۆر بۆ خواردنو حەوانەوە خەرج کەنو، سەرباری ئەوەش، دەبێ خاکە ئەسلیەکەی خۆیان جیبهیلن وەك بەباشی دەزانریت، زۆرایەتی ئەمانە سەر بەخیلی هەمە جۆرن، کە بەپیی خوو نەریتیان، هەر ئەوەندەی هەلیکیان بۆ هەلکەوتبی بۆ تۆلەسەندن، لەسنور پەریونەتەوەو دەستیان کردۆتەوە بەکاری توندوتیژیو تالانی لە ئیراندا.**

**لیرەوە، چەندین گیروگرفتو سەرهەلدانی میللی روئەداتو، حکومەتی تورکیش ناچار دەبیت هیزیکی سەربازی گەورەو هەمیشەیی لەو ناوچانەدا بهیلیتەوە بۆ ریگەگرتن لە ئاژاوەی ناوەوەو هوروژوم بۆ ناو خاکی ئیران.**

**لەبەر ئەوە، بابی عالی داوای پیویستی کۆتایی هینان بەم کۆچکردنە دەکات بە بانگهیشتنی سیاسەتیکی ریکەوتن، کە بۆ کەرامەتی شیاوتر دەبێو، هەروەها باشتریش دەبێ بۆ ئەو خەلکە.**

**سەبارەت بە هوروژم کردن بۆ ناو خاکی ئیران لەلایەن رەعیەتەکانی تورکیاوە، یا ئەو زەرەرو زیانەی خیلە تورکەکان لەناو خاکی ئیراندا ئەیدەنو، ریگەگرتنیش لە**

دوباره بونەوەی ئەو کارە نارەوایانە، زۆر پیویستە لەسەر سەفارەتی ئیران داواکەی بابی عالی قوبولٚ بکاتو، کۆمیسیونیکی تایبەت بۆ ئەو ناوچانە بنیریت، بۆ ئەوەی چی دەتوانێ بیکا بۆ ریگەگرتن لەو زەرەرو زیانو ئازارەی تورکەکان بەدەست خیلە ئیرانیەکانەوە، دەیچیژنو، دلنیاییش لەو بارەوە بدات.

## هاوپیچی ٧ی ژمارە: ٧٤

**نامەیەك لە سەفارەتی ئیرانەوە بۆ بابی عالی، لە بەرواری ١١ی موحەرەم ی ١٢٩٨ (١٣ی کانونی دوهەم، ١٨٨٠)**

(تەرجەمە)

نامەکەتان بە بەرواری ٢٦ی زو الحجە، ١٢٩٧ (٣٠ی ت ٢ی ١٨٨٠) گەیشت، کە نیشانە ئەدات بە "داوایەك کە ئاراستەی بابی عالی کراوە بۆ گرتنو سزادانی چەند سەرۆکو ناودارانی ئیران کە، کاتیك لەشکرەکانی ئیران گوشاری توندی خستونەتە سەر، پەنایان بردوە بۆ ناو خاکی تورکیا." لەم نامەیەدا، ئیوە دەلین، لەولایەتی وان وە هەوالٚ وا گەیشتبو کە ئەو خەلکانەی لە سنور پەریبونەوە پەناهەندەنو داوای پەناهەندەییان کردوە، بەشتیکی سروشتی زانراوە کە پاش چەك لی سەندن لییان، وەربگیرینو؛ وەکە ٦٠,٠٠٠ یان ٧٠,٠٠٠ لە دانیشتوانی ورمێ کۆچیان کردوەو، ٢٠٠ خیزانیشیان گەیشتونەتە نزیك هەکاری. ئیوە هەروەها دەلین، کە لە ئەنجامی ئەم هەوالەدا فەرمان دەرکرابو تا بەخیرایی بچن بەهانای ئەم خەلکانەوە، کەچی لەهەمان کاتدا ریگە لە کۆچکردنی زیاتر گیرابو؛ بریاردراوە کە کۆمیسیونیکی تایبەت بۆ شوینەکە بنیردریت تا بزانیت گەر هیچ لە خیلە تورکەکان خەریکی نانەوەی ئاژاوەن لە ناو خاکی ئیرانداو، گەر واش بیت، هەنگاوی پیویست بنیت بۆ ریگەگرتن لەدۆخیکی بەردەوامی لەو جۆرە. ئیوە گەیشتونەتە ئەو ئاکامەی داوای ریگەگرتن لەو زولمو ئازارو زیانەی گازەندە دەکەن کە رەعیەتە تورکەکان لە خیلە ئیرانیەکانیان دابێ. لەبەر ئەوەی ئیوە ناوی ئەو کەسانەی کە بە ناودارو سەرۆکە ئیرانیەکان ئامازەیان بۆ دەکەنو ناچار کراون پەنا بەرنە بەر خاکی عوسمانی نەداوینەتێ، کاریکی مەحالە بزانین کینو، سزای هیچ کەسیکیش بەو ئامازە کردنە داوا نەکراوە. ئەگەر ئەو درندانەی بەو ناوە ئامازەیان بۆ کراوە کوردی ئیران بن کە ئیستا لە گەلیاندا لە جەنگداینو، بە دوژمنیان دادەنیین، وە ئەگەر دوای ئەو دلنیاکردنەوانەی لەسەر ئەو مەسەلەیە کراونو، دوای ئەوەیش کە ئەو جۆرە خراپەکاریانەیان ئەنجام دابیت، ئیوە هیشتا پیشوازیان لیبکەنو دالدەیان بدەن، دەتوانین تەنها ئەوە وەلامە بدەینەوە کە ئیمە زۆر بەداخین.

ئەو خەلکانەی کە لە ئێراندا ڕیگەی یاخیبونیان گرتوە، دو جۆرن: جۆریکیان لەو رەعیەتە ئێرانیانە پیکهاتون کە شیخ عوبەیدوللەی بەدناو سەری لیشیواندونو، پاش ئەوەی لە یاخیبونەکەدا هەزاران خەلکی بەدبەختیان کوشتو، چەندین شارو گوندی ئاوەدانو پر سامانیان کاولکرد، هەڵاتون بۆ ئەو دیو سنور، تا لەو سزایە دەربازبن کە بە قانون دەیانگریتەوە. ئەمانە ئەو درندانەن کە ئیمە بە توندی داوا دەکەین پەنایان نەدەن، بەلکو بیاندەنەوە دەست کاربەدەستەکانی سەر سنور، بەپیی ئەو پەیماننامانەی کە هەن.

جۆرەکەی تر، لە کورەکانی شیخو باندیکی ١٠,٠٠٠ یا ١٥,٠٠٠ لە رەعیەتەکانی تورکیا پیکهاتوە. دلنیاکردنەوەی بەردەوام پیشکەش کرابو کە ریگە نەدرین لە سنور بپەرنەوەو، سەربازیش کۆکرابونەوە بۆ ئەوەی بوەستینرین، کەچی نەیانتوانی ریگە لە چونیان بگرن. چونە ناو خاکی ئیرانەوەو هەمو جۆرە خراپیو کاری نارەوایان کرد، بەلام هیچ هەولیك نەدرا بۆ گرتنیان کاتیك گەرانەوە، وە تەنانەت شیخیش هەروەك لەنامەکەی پیشودا ئاگاردار کرابون ئیستا خەریکی نانەوەی ئاژاوەو گرفت دروستکردنە لەناو وڵاتەکەماندا، چونکە بە بەردەوامی هەولی چەکدارکردنی خەلکو ناردنیانە بۆ زیاد کردنی هیزەکانی تالانی. دەخوازم بۆ جاریکی تریش بەتوندی ئەوەت بخەمەوە یاد کە، ئەگەر شیخ، کە سەرچاوەیەکی بەپیتی ئاژاوەو فتنەیە، نەگویزریتەوە بۆ شوینیکی دورو، بەیەکجارەکی حەپس نەکریت، بەرپرسیاریتیەکە دەکەویتە ئەستۆی سەبەبکارە راستەقینەکەی ئەم دۆخە.

ئینجا دیینە سەر ئەو خەلکانەی لە ورمیوە کۆچیان کردوە. ئیوە چاك دەزانن کە ئەو کەسانەی کە بەشداریان نیە (مشارکە) لەگەڵ خراپەکەراندا، هەرگیز هەست بەنارەحەتی ناکەنو ناترسنو، هیچ هۆیەکیش کە مالەکانیان جیهیلن. ئەم کۆچکەرانە، پیویستە هەندی بن لەجۆری یەکەم، مەبەست لەوە هەندی لەو کەسانەیە کە بە پیلانەکانی شیخ فریودرابون؛ ئەو کۆمەلە کافرە ناپەسەندانەی (وغد– لئیم) کە هەمو دانیشتوانە نیرینەکانی زیاتر لەسەر گوندیان کوشتو سەربری، کە مەمکی ئافرەتە بە تەمەنەکانیان بریەوە، منالیان لەباوەشی دایکیاندا دەرهیناو هەلیاندانە ناو ئاگرەوە، زیاتر لە حەفتا کچیان کون کردو، هەمو جۆرە کاریکی خراپو نارەوایان ئەنجامدا.

پاراستنی ئەم پیاوانە، دەبیتە هاندانی کاری نارەواو خراپەکاری، بە بەردەوامیو بی سنورو، دەبیتە پیچەوانەی ئەو ئاشتیە دۆستانەیەی کە ئیستا لەنیوان دو دەولەتەکەدا هەیە (کە پیویستە بۆ خیرو خۆشی ئیسلامی یەکگرتو)و، وە هەروەها دژ بەو یاسایانەشن کە پەیوەندی بە دەولەتی زلهیزی هاو سنورەوە هەیە. من هۆی

تەواوم هەیە کە داوای ئەوە بکەم فەرمانی بەپەلەو چارەنوس ساز بۆ کاربەدەستە خۆجییەکان بنێردرێت تا پەنای ئەم خەلکانە نەدەن‌و، ڕیگەشیان نەدەن لە سنور بپەڕنەوە. سەبارەت بە دەرکردنی لێبوردنێکی گشتی‌یشەوە، ئەوە مەسەلەیەکە حکومەتەکەم بڕیاری لەسەر ئەدات. بێگومان، شتێکی ئاشکرایە کە حکومەتەکەی من بەزەیی‌و رأفە بەلادا نانێت. پێکادان‌و بەرەنگاربونەوەی کەم چەندین جار لەنێوان خێلەکانی هەردو دیوی سنوردا ڕویداوەو، شتێکیش نیە کە یەکەم جار بێت کە حکومەتەکەم چاو لە خراپەکاری‌وا دەپۆشێ؛ وە پێویستە ئەوەشتان پێ ڕابگەیەنم کە لەلایەن ئیمەوە هەروەها بڕیار دراوە کومیسیونێکی تایبەت بۆ شوێنەکە بنێردرێت تا لێکۆلینەوە لەسەر مەسەلەکە بکات.

## هاوپێچی ٨ی ژمارە: ٧٤

### نامەیەك لە سەفارەتی ئێرانیەوە بۆ بابی عالی، لە ١٢ی موحەرەمی ١٢٩٨دا (١٥ی کانونی یەکەمی ١٨٨٠)

(تەرجەمە)

ئاشکرایە کە، بەگوێرەی مەرجەکانی یاسا کەتایبەتن بە ڕۆژنامەگەریەوە (صحافة)، ئەو ڕۆژنامانەی لە ئەستەمولْ چاپ دەکرێن‌و بلاودەکرێنەوە، ڕوبەڕوی سزادان دەبنەوە گەر زمانی نابەجێ بەکاربهێنن، تەنانەت بەرامبەر تاکە کەسانی تایبەتیش. بەداخەوە، لەماوەیەك لەمەو بەرەوە تی‌بینی ئەوەمان کردوە کە ڕۆژنامەی "Vakit" بەواتا "Terdjimani- Hakikat" (ترجمانی حەقیقەت)و "Djerede-i- Havadis" (جەریدەی حوادس"، لە نوسینیاندا لەسەر ئەو یاخیبوە کوردانەی لە سنوری ئێراندا دەرکەوتون، هەندێ وتاری زۆر زیانبەخشیان بلاوکردۆتەوە، کە دنەو هانی خێلە کوردەکان ئەدەن‌و، تۆوی ناکۆکی لەنێوان ڕەعیەتەکانی هەردو دەولەتە موسولمانە گەورەکەدا دەچێنن؛ بەلام لەگەلْ ئەوەشدا کە ئیمە داوامان کردوە کە هەندێ زەوابتیان لەسەر دابنرێت، کەچی بیرۆی ڕۆژنامەگەری (Bureau de la presse) هیچ جۆرە کاریکی بۆ ئەو مەسەلەیە نەکردوەو، ئەم خۆگێل کردنەی کاربەدەستانیش بێ ئابرویی (وقاحە) ئەو ڕۆژنامانەی دو ئەوەندە زیاد کردوەو، وای لێکردون زمانی توندوتیژ بەشێوەیەکی نائاسایی بەکاربهێنن، سوکایەتی بە ئاینی میللەتی ئێران بکەن، حکومەتەکەیان بەکەم بزانن گالتەی پێ بکەن‌و، ناوی فەرمانبەرە سیڤیل‌و سەربازییەکانیان بەخراپ بهێنن‌و جنێویان پێ بدەن. ئەم ڕۆژنامانە، لەڕیگەی پۆستەوە خۆیان دەکەن بە هەمو قوژبنێکی خاکی ئیمپراتۆریەتداو، شتێکی ئاشکراشە کە ئەو وتارە زیانبەخشانەی تیایاندایە، دەبنە هۆی هاندانی یاخیبوە

کوردەکان، چونکە ئەوان وەك ئەو هیمایە لیکی دەدەنەوە کە جوڵانەوەکانیان لە پایتەختدا پشتیوانی بۆ پەیدا دەبیت. هەروەها لە ئیرانیشدا، ئەو رۆژنامانە لە هەر شوینیك بخویندرینەوە، هەمان واتاو بایەخیان دەبیت.

لەمیژەوە هەردو دەولەتەکە بەپەرۆشن کە سەرچاوەکانی ئەم ترسە دور بخەنەوە، چونکە پیویست ناکات ئەوە بخەینە رو کە ئەو زمانەی لەم رۆژنامانەدا بەگەر دەخرین، دەبنە هۆی خوین رشتنیکی زۆر لەنیو خیلە کوردەکاندا. خەلکەکە، هەریەك لەم رۆژنامانە بە لیکدەرەوەی بیرو بۆچونو رای بەشیك لە کۆمەڵ دادەنینو، لەبەر ئەوە شیوازیان لە سوکایەتی پیکردنی کردارەکانو سیاسەتی دەولەتیکدا کە لە دەمیکەوە دۆستی تورکیایەو، قسە وتن (جنیودان) بە فەرمانبەرەکانی؛ پیشیلی (خرق- انتهاك) یاسای دەولەتان دەکاتو، ناچارمان دەکات داوای سزادانیان بکەین.
لەبەر ئەوە من بەشیوەیەکی رەسمی داوا لە وەزارەتی دەرەوە دەکەم کە ئەو ریوشوینانە بگریت کە بەهەمان شیوە لە یاساکانی خۆیاندا پیرەو دەکریت، ئەویش بەو تەباییو ئاشتیو ریککەوتنە تەواوەی لەنیوان دو زلهیزەکەدا هەیەو، هەروەها ئەو یاسایانەی پەیوەستن بە سنوری هاوبەشی دەولەتانەوە.

## ژمارە: ٧٥

لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل (لە ٦ی کانونی دوەمدا گەیشتوە)

گەورەم، تاران، ٢٩ی ت٢، ١٨٨٠.

مستەر ئابۆت پیی راگەیاندم کە کۆپیەك لە راپۆرتەکەی خۆی لەسەر دۆخی نەستۆریەکانی ورمێ، بۆ جەنابتانی راستەو خۆ بەپۆستدا رەوانە کردوە.

سەردانەکەی بۆ ئەو ناوچەیە، لە ساتیکی ناگونجاودا بوە. یاخیبونی کوردەکان، هەر دەمودەست پاش گەیشتنی دەستی پیکردوەو، پیش ئەوەیش کە بتوانیت خۆی ئامادە بکات لەو شوینە دەرچیت، کوردەکان پیشرەوییان کردو هەمو ئاواییاکانی ئەو دەورو بەرەیان داگیر کردو، شارەکەش دوای ئەوە لەلایەن شیخ عوبەیدوالللەوە گەمارۆ درا. وەزعی مستەر ئابۆت لەم بارو دۆخانەدا، زۆر دژوار بو. بەڵام پیدەچێ ئەو لیکۆلینەوەیەی کە خۆی پیوە خەریك کردبو، بەشیوازیکی باشو پر رەزامەندی (مرض) ئەنجام دابیت، هەروەها سەبارەت بە مامەلە کردنی لەگەڵ کاربەدەستە خۆجێییە ئیرانیەکانو، سەرۆکە یاخیبوەکانیشدا، کە پیویست بو پەیوەندیان لەگەڵ ببەستیتو، لەو باوەرەشدام کە لیوەشاوەییو بیروبۆچونیکی زۆری پیشان دابو.

لیکۆلینەوەکانی مستەر ئابۆت ئەوە پیشان ئەدات کە، تەنانەت بەر لە کاولکردنی وڵاتەکە لەلایەن کوردەکانەوە، دانیشتوانەکانی ورمێ، هەم موسولمانو هەم

مەسـیحیەکانیش، بـەڵام بەتایبـەتی ئەوانـەی پیشـەوە (موسـولمانەکان)، چەرمەسـەریەکی زۆریـان بینـی بـو بەدەسـت پـەلامارو جـەردەیی کوردەکانـەوەو، لـەو روەشەوە، بینینی دۆخەکانی ئەم بەشەی ئیران زۆر دلتەزین بو.

بـەڵام سـەبارەت بـە نەسـتۆریەکان، بەشـیوەیەکی گشـتی وا دەردەکـەوت کـە کاربەدەسـتە ئیرانیـەکان بەباشـی هەلسـو کـەوتیان لەگـەلدا بکـەنو، هیـچ گـازەندەو سکاڵایەکی تازەیان نەبو، ئەگەرچی هەندێ لەگازەندە کۆنەکانیان هیشتا مابۆوە.

نەسـتۆریەکانی ئـیران لـە گونـدە نزیکـەکانی لای ورمـێدا هـەمو بەپیشـەی کشـتوکالیەوە خـەریکن، کـە یـان هـی سـەرۆکە موسـولمانەکانە، وە یـان لـەژیر کۆنترۆلیاندایە. ئەمانەش زۆربەیان خیلی ئەفشارن، کە وەك یاسا چەندیك زۆر بتوانن باج لە جوتیارە موسولمانەکانو مەسیحیەکان بەبێ جیاوازی دەستینن.

ئەو کاری چەوساندنەوەیەی کە ئەوانەی دواوە (مەسیحیەکان) سکاڵای لی دەکەن ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١-بری باجی خانو کە لە مەسیحیەکان بەزۆر دەستینرێو، لەوانەش زیاترە کە لە موسولمانەکان دەستینرێ.

٢-سەپاندنی کاری بەزۆر لەلایەن خاوەن مولکەکانەوە بۆ کیڵانی زەویەکانیان؛ ئەمەش زولمیکە کە هەم موسولمانەکانو هەم مەسیحیەکانیش دوچاری دەبنەوە.

٣-راوو روتـی فەرمانبـەرە ئیرانیـە ناونجیـەکان کـە لـە نەسـتۆریەکانیان دەکـەن کـاتیك کـە لـە روسـیا دەگەرینـەوە بـەو رەنجـەی لـەکارەکانیان لـە وڵاتـە لـەماوەی مانگەکانی هاویندا دەستیان دەکەویت.

٤-فراندنی بەزۆری کچە مەسیحیەکان لەلایەن موسولمانەکانەوە؛ وا باسدەکریت کـە ئیسـتا لـەجاران کـەمتر روبـدات، چـاککردنو بژاردنیـش لەلایـەن کاربەدەسـتە ناوچەییەکانەوە دەکریت، کاتیك حالەتی لەو جۆرانە دەهینریتە بەردەمیان.

٥-نـادادوەری (ناعەدالـەتی) ریگـەدان بەهـەر ئەندامیکی خیزانیکی مەسیحی کـە بوە بە ئیسلام کاتێ داوای مولكو مالی هەمو خیزانەکە دەکات.

٦-رەفزکردنی شایەتی مەسیحیەك دژ بە موسولمانیك لەدادگادا.

ئەم زولمانـە هـەمان ئەوانـەن کـە چـەندین سـالە ئیمـە تەقـەللای بـۆ دەدەیـن کـە کاربەدەسـتە ئیرانیـەکان چاکیـان بکـەن. شـوینی رەزامەندیـە کـە لـە قسـەکانی مسـتەر ئـابۆتو ئەوانـەی میسـیونیرە ئەمریکاییـەکانو نەسـتۆریەکان خۆشـیان وا دەزانـن کـە، ئەگەر ئەمانە بە تەواویش نەگویزرینەوە لە هەمو حالەتیکدا نارەحەتیو ئازاریـان کـەم بۆتەوە، هەر وەك ئەوەیش کە دان بەوەدا نراوە کە دۆخی نەستۆریەکان لـەم ساڵانەی دواییدا زۆر چاك بوە.

لەسەر فەرمانەکانی شا، وەزیری کاروباری دەرەوە پرۆژەیەکی ئامادەکردوە بۆ زیاتر چاککردنی دۆخی مەسیحیەکانی ورمێ، ئەوەیش هەر ئەوەندەی نیزام لە سەرتاپای ئەو ناوچەیەدا دەگیردریتەوەو کاربەدەستەکانیش لە وەزعیکدا دەبن کە بتوانن ئەو ریو شوینانە پیشنیار کراون بە شیوەیەکی کاریگەر جیبەجێی بکەن. ئەو هیشتا ئەم نوسراوەی بۆ نەناردوم، ئەویش بەهۆی ئەوەی تا ئەم ماوەیە سەرقال بوە بەمەسەلەی بە پەلەی ترەوە کە پەیوەندیان هەیە بە دامرکاندنەوەی سەرهەلدانی کوردەکانەوە. بەلام گفتی داوە کە لەم حەفتەیەدا باسی مەسەلەکەم لەگەلدا بکاتو؛ منیش هەولئەدەم لە بەرنامەو ریو شوینەکانیدا بۆ چاککردنو لابردنی ئەو زولمو گازندانەی لەسەرەوە باسکرا، بەشداریم هەبێ.

من چاوەروان ناکەم کە دەربارەی ئەمانە هیچ گرفتیك دروست ببیت، بیجگە لە دوانەکەی دواوەو، بۆ ئەمانەش، پیشنیار دەکەم کە وەك حالەتی تاك کە لەوانەیە روبدەن، مامەلەیان لەگەلدا بکریت. من پیشنیار دەکەم کە مستەر ئابۆت داوا لە میسیۆنیرە ئەمریکاییەکان بکات کە راپۆرت لەسەر هەر حالەتیکی دردۆنگ (فاضح– شنیع) بدەن، لەوانەی کەبەشیوەیەکی ناعادلی لە مامەلەکردن لەگەل مەسیحیەکاندا رو ئەدات بەهۆی ئەوەی مولكو مالیان لەلایەن ئەو کەسانەوە داوا دەکریت کە ئاینیان گۆریوە بۆ ئیسلام، وە یان بەهۆی شایەتی مەسیحیەك دژی موسولمانیك کە رەفز دەکریت؛ وە لەحالەتی چاککردنیك لەکاربەدەستەکانی تەوریز جیبەجی ناکەن، ئەوسا روداوەکان لەریگەی وەفدی حکومەتی خاوەن شکۆوە دەخریتە بەردەمی شا، کە لەو باوەرەدام دلسۆزانە دەخوازیت رەعیەتە مەسیحیەکان لە بەرامبەر هەمو کاریکی چەوساندنەوە بپاریزریت.

مستەر ئابۆت دەلیت نفوزی میسیونیرە ئەمریکاییەکان ئەوەندە دەبیت کە نەستۆریەکان لە حالاتی چەوساندنەوەی ئاسایی بپاریزیتو، کاتیکیش حالەتی زۆر خراپ روئەدات، مسیۆنیرە ئەمریکاییەکان دەیگەیەننە تەوریزو، حالەتەکەش یان لەریگەی کاربەدەستەکانی ئازەربایجانەوە، وەیان لەوانەی لە تارانن، چاك دەکریت. تێبینی ئەوەش دەکریت کە ئەو (مستەر ئابۆت) هەروەها رای خۆی دەردەبریت بەوەی کە فەرمانبەرە ئیرانیەکان، وەك یاسایەك، ئیجگار لەخۆبوردو بە تەحەمولنو، هەرگیزیش لە مەسەلەی ئاینییدا تەنگ بە مەسیحیەکان هەلناچنن.

من بە تەواوی لەگەل ئەو بۆچونەی کە مستەر ئابۆت دەریبری یەك دەگرمەوە، کە دانانی ئەفسەریکی کۆنسولخانەی بریتانی کە لە ورمێ نیشتەجێ بێ، کاریکی گونجاو نیە.

(ئیزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ٧٦

**لە ئابۆت ی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆ ئیرل گرانڤیل- (لە ٦ی کانونی دوەمی ١٨٨١دا گەیشتوە)**

**گەورەم، تەوریز، ٤ی ك١، ١٨٨٠.**

**ئاماژە بەنامەکانم لە ٢٣و ٣٠ی مانگی رابوردودا، دیسان شەرەفی ئەوەم هەیە کە کۆپی چوار نامە کە ئاراستەی وەزیری مفوض حکومەتی خاوەن شکۆ لە تارانم کردبو، بۆ جەنابتان بنیرم، دەربارەی شالاوی دژ بە یاخیبوە کوردەکان، مولدانی هیزیکی روسی لە نەخچەوان لەسەر سنوری ئاراس، وە هەلاتنی شیخ عوبەیدوالله بۆ ناو خاکی تورکیا.**

**(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت**

**هاوپیچی ١ی ژمارە: ٧٦**

**لە ئابۆت ی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆ مستەر تۆمسن**

**بەریز، تەوریز، ١ ك١، ١٨٨٠.**

**بەم دواییانە، لیرە هەوالیك بلاو بوە کە عوبەیدوالله لەگەڵ هیزیکی اسماعیل ئاغا کلیسیدا گەراونەتەوە بۆ ناوچەی برادۆست، بەلام ئەو دوا نامانەی کە لەورمێوە بە بەرواری ٢٥ی مانگی رابوردو گەیشتونەتە ئیرە، لەسەر ئەم مەسەلەیە بێ دەنگن، تەنیا ئەوە دەلین کە شیخ هەلاتوەو لەشکرەکەشی بلاوەی پیکراوە، دو کورەکەی بەهیزیکی گەورەوە لە مەرگەوەر بونو، دو فەوجیش لە ٢٣ی مانگی رابوردودا لە ورمێ لە دەرچون بۆ ئەو شوینە.**

**هەروەها هەوالی رۆشتنی تەیمور پاشا خان لەگەڵ هیزیکی ٦٠٠٠ کەسیدا بۆ برادۆست گەیەندراوە. ئیقبال الدولە هیشتا لەگەڵ ٢٠٠٠ کەسدا لە ورمێیە.**

**وا پیدەچێ ئەو لەشکرەی کە بابی عالی ناردبوی بۆ سنور، بەشیوەیەکی کاریگەریی ریگەی پاشەکشەکردنی یاخیبوەکانی بۆ ناو خاکی تورکیا بری بیت.**

**(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت**

## هاوپیچی ۲ی ژماره: ۷٦

له ئابۆت ی کۆنسۆلی گشتیەوه بۆ مستەر تۆمسن

بەریز، تەورین، ۳ی ك۱، ۱۸۸۰.

پیم گەیشتوه (زانیومه) که تا ئیستا هیچ هیزیکی روسی نەگەیشتۆته جەلفا، وه دوا شوینی (وجهه) ئەوانه، ئیستاکه نەخچەوانەو، ژمارەی گەیشتنیان رۆژانه بۆ ئەوێ، نەزانراوه.

## هاوپیچی ۳ی ژماره: ۷٦

له ئابۆت ی کونسۆلی گشتیەوه بۆ مستەر تۆمسن

بەریز، تەورین، ٤ی ك۱، ۱۸۸۰.

دوینێ، نامەکانی بارگەکەی (کامپ) سوپاسالار له سولدوز به پایەبلندی شاهانەی راگەیاندوه که شیخ لەگەڵ نۆ کەس لەلایەنگرەکانی (اتباع) هەڵاتون بۆ نۆچێی جیگەی نیشتەجێی لەناو تورکیادا. من ئەم هەوالەم تەنیا ئەمرۆ بیستوەو، ماوەیەکی کەمیش دوای ئەوه نامه له ورمێوه گەیشتوەو تەئکید لەسەر ئەو هەواله دەکاتو دەلیت که "شیخو دو کورەکەی دەبێ له نەهری بن". ئامارژه بۆ ماڵو بارەگاکەی شیخ بۆ ئەوێ دەکرێ. ئەم شوینه که به نەیری تەلەفوز دەکرێ، پایتەختی نۆچیەیه. له نەخشەکاندا بەنیرجی دەکیشریت، بەڵام پیویسته لەگەڵ ئەو گوندەی که بەهەمان ناوەوەیه لەسەر سنوری مەرگەوەر، تیکەلی نەکەین (لیمان تیك نەچیت).

نامەکه لەسەری دەرواتو دەلیت "لەکۆتاییدا شیخ لەگەڵ پانزەکەس لەلایەنگرەکانی بەناوچیاکاندا هەلهاتنو رۆیشتەوه بۆ مالەکەی.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپیچی ٤ی ژماره: ۷٦

له ئابۆت ی کۆنسۆلی گشتیەوه بۆ مستەر تۆمسن

بەریز، تەورین، ٤ی ك۱، ۱۸۸۰.

حالی حازر، هیزەکەی روس له نەخچەوان، له ۱۰۰۰ کەسو عەرادەیەکی تۆپخانه پیکهاتوه.

هەروەها پیم گەیشتوه، که ئەم هیزانه بەشیکن له شەش بەتالیۆن، ئەوەیش که ماوه بەهۆی بەسەرچونی کاتەوه، گەراونەتەوه؛ لەوەش ناچیت که ئەمانه له نەخچەوان بگۆردرین، بەڵام ئەگەر تەواوکردنیك بکریت (هەمو بەیەکەوه دابنرین)، وا

سەرجەمەکەی دەگاتە نزیکەی ٦,٠٠٠ کەس. ئەفسەرە فەرماندەکانی ئەم هێزە وای بۆ دەچن کە وەك پاراستن‌و پاسەوانیکی زیادە بەهۆی یاخیبونەکەی کوردستانەوە نێردراونەتە سەر سنورەکەو، بۆ ڕێگەگرتنیش لە کوردەکانی تورکیا، لە تێپەڕبونیان بە ڕوسیادا بۆ ناو خاکی ئێران.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## ژمارە: ٧٧

لە ئابۆت ی کۆنسوٚلی گشتی‌وە بۆ ئێرل گرانڤیل– (لە ٦ کانونی دوەمی ١٨٨١دا گەیشتوە)

گەورەم،                                    تەوریز، ٧ك١، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کۆپی هەلبژاردەی ئەو نامانە بۆ جەنابتان بنێرم– پێکهاتون لە پێنج هاوپێچ– کە لە قۆناغیکی زوی یاخیبونی کوردەکاندا ئاراستەی وەزیری مفوض حکومەتی خاوەن شکۆ لە تارانم کردوە.

نامەکەی بەرواری ٢٧ی کانونی یەکەم، لەکاتیکدا نوسراوە، کە خەریکی ڕۆیشتن بوم بۆ ورمێ.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپێچی ١ی ژمارە: ٧٧

لە ئابۆت ی کۆنسوٚلی گشتی‌وە بۆ مستەر تۆمسن

بەرێز،                                    تەوریز، ١١ی ئەیلول، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە ڕایبگەیەنم کە هەمزاغای بلباس‌ی خێلی مەنگوڕ، کە چەند سالیك لەمەوبەر هەلاتبو بۆ تورکیا، لەو کاتەوە رەفزی کردوە بگەڕیتەوە بۆ ئێران‌و باج‌و خەراج بە شا بدات؛ بەلام بەم دواییانە، هاتوە بۆ سابلاخ‌و فیلیکی کردوە بەوەی کە تەسلیم دەبێ‌و ملیش بۆ حکومەتی ئێران دادەنەوێنێ.

شازادەی حاکمی سابلاخ هەولی‌دا بیگریت؛ بەلام توانی بەسەر پەلاماردەرەکانیدا زال بێت‌و، چەند کەسیکی لێ کوشتن، دواییش خۆی‌و چەند سوارەیەکی کورد، کەنزیکەی سەد کە ئەبون، بەباشی دەرباز بون.

وا باوەر دەكريت كە هەمزاغا ئيستا لەگەڵ خيلەكەيدا لە بارەگاكەياندا بن لەنيوان سابلاغو لاهيجان داو، حكومەتى ئيرانيش هيزيكى سەربازى نزيكەى ٢,٠٠٠ كەس دەنيريتە سەر بۆ بەزۆر مل پى دانەواندنى.

حكومەتى ئيرانى نيازى نيە ريوشوينى توندو تيژ دژى هەمزاغا بگريتە بەر، ئەگەر بگاتە تيگەيشتن لەگەلياندا، بەلام بە پەرۆشيشن دەربارەى ئەوەى كە دور بخريتەوە لەگەرانەوە بۆ توركيا، چونكە دور نيە كە لە ئاكامدا نەرواتو نەداتە پاڵ شيخ عوبەيدوالله (دلسۆزى خۆى پيشكەش بكات)

(ئيمزا) وليام جى. ئابۆت

## هاوپيچى ٢ى ژمارە: ٧٧

### لە ئابۆت ى كۆنسۆلى گشتيەوە بۆ مستەر تۆمسن

(هەلبژاردە) تەوريز، ١٦ ك١، ١٨٨٠.

ئەم دواى نيوەرۆيە، نيردراوى (عميل– وكيل) وەزارەتى دەرەوە سەردانى كردم. گوتى، وەليعەهد لەسەرچاوەى هەمە جۆرەوە هەوالى پيگەيشتوە كە، هەمزاغاى سەرۆكى كوردى، كە لە نامەكەى ١١ى ئەم مانگەمدا ئامارژەم بۆ كردبو، داويتيە پاڵ شيخ عوبەيدواللەو، ئەمەى دوايشەوە (شيخ) هەلويستيكى پر مەترسى هەبوە بەرامبەر بە ئيران. نيردراوە كە هەروەها گوتى، ئەو زۆر باوەرى بەو واتەواتانە نەكردوە، بەلام كاتيك كە پايە بلندى دەبيستێ سنورەكانى ورمێ لە دۆخيكى زۆر پر ئاشوبەدان، نيردراويكى خيرا بۆ لاى ئيقبال الدولە دەنيريت بۆ دلنيابون لە راستى وەزعى دۆخەكە.

## هاوپيچى ٣ى ژمارە: ٧٧

### لە ئابۆت ى كۆنسۆلى گشتيەوە بۆ مستەر تۆمسن

(هەلبژاردە) تەوريز، ٢٢ك ١، ١٨٨٠.

ليرە، واتەواتيك لەناو خەلكدا بلاوە كە هەمزاغاو شيخ عوبەيدوالله بەلەشكريكى گەورەوە پيشرەوى دەكەن بۆ سەر شنۆ. ئەحمەد ئاغاى ماميش كە لايەنگريكى گوێ رايەلى شايە، هەروەها لەگەڵ هەمو خيلەكەيدا داويانەتە پاڵ شيخو، ئەوەكەى دواوە داوا لە ئيران دەكات كە واز لەو ناوچەيە بهينيت كە تا روبارى جاغەتو دەگات لاى باشورى مەراغەوە. هەروەها دەركەوتوە كە لەشكرەكەى شيخ ٣٠,٠٠٠ كەسن، بەشيكى زۆريان تفەنگى مارتينىيان پييە، بەلام هەمو ئەو گوندانەى كەوتونەتە ريى

پیشـرەویەکەیان دەسـت لینـەدراونو تـەنگیان پیهەلنـەچنراوە، هـەمو ئـەو زەخـیرەو کەلوپەلەی پیویستیش بوبێ، شیخ بەپارە کریونی.

نیردراوەکەی وەزارەتی دەرەوە باوەری نیە بەم هەواله ئاگادارکەرەوانەو، دەلیت، وەلیعەهد زانیاری تازەی پیگەیشتوە کە هـەمزاغا لەبارەگاکـەی خۆیـەتی لەیـەکیك لـە گوندەکانی خۆیدا لەناوچەی مەرگەوەر، وە شیخیش لەمالی خۆی لەنۆچێ نەجولاوە، نیردراوەکە بەهیوایە کـە پایـەبلندی شاهانە بەو زوانـە لـەورمێو سابلاخەوە زانیاری شوین باوەری پێ بگات، سەبارەت بە جموجولو نەخشـەکانی هـەمزاغاو شیخ، پاش گەرانەوەی ئەو پەیامبەرە خیرایەی ئیقبال الدولە ناردبوی بۆ تەوریز.

حکومەتی ئازەربایجان خەریکی خۆسازکردنن بۆ شالاویکی سەربازی لە حالـەتی پەلەداو، جەنەرالی ئەمشاری، ئاغاخان هەلبژیردراوە بۆ فەرماندەیی کردنـی؛ بـەلام تـا ئیمـرۆش، تـەنیا ژمارەیـەکی بچـوك لەسـوارەی نـانیزامی لـە قـەرەدەوە بـۆ سـابلاخ نیردراون. هـەروەها پیم گەیشتوە کە، ئیسـتا چـوار پارچـە تۆپخانـە بـەریگاوەن بـۆ ناوچەکەو، هیزەکانی ئەم شارە، هی مەراغە، وە شوینی تریش بۆ هـەمان ئـەرك لـەژیر فەرماندان.

من ئاگادارم کە ئیقبـال الدولـە بـۆ وەلیعـەهدی رونکردۆتـەوە کە نـاتوانریت هـیز لەورمێ کۆبکریتـەوەو، شتیکی باشیش نابیت مەرکـەزیکی سنوری ئاوها گرنگ لـە ئـامرازی بـەرگریکردن بەرامبـەر هوروژمـی کوردەکـان روتبکریتـەوە. بیگومـان، ئـەو هەوالانـەی سـەرەوە سـەبارەت بە هەولویستی دوشمنکارانـەی شیخ بەرامبـەر ئـیران، پیویستە چەند بتوانرێ بە وریاییو تحفظ وە وەربگیریت. من لەو باوەرەدام کە زۆری پیوەنراوە، گـەر هەموشـی دروست نـەکرابیت؛ بـەلام ئـەو بۆچونـەی مـن لەنامـەکانی پیشـومدا دەرم بریبـو سـەبارەت بـە پیویسـتیی پوچـەڵ کردنـەوەی ئـەو نفـوزە خەتەرناکەی شیخ هەیەتی بەسەر لایەنگرە کوردەکانی شادا کە، هاو ئایینن (دیارە مەبەستی مەزەبە)، نەگۆر دەمینیتـەوە؛ وە واشـی بۆ دەچم کە حکومەتـەکانی ئیرانو تورکیـا نـاتوانن چاویـان لـەو دۆخـەی ئیسـتا بنوقینـن، کـە پیدەچـێ داوای گرتنـی ریوشـوینیکی تـەواو راسـت بکـات بـۆ دور کەوتنـەوە لـە تعقیـدات (گرفـتو کیشـە) جدیەکانی داهاتو.

بۆ ئـەوەی، ئـەوەی سـەرەوە بنوسـم، چاوم بەهاوکارە تورکیەکـەم کـەوتوەو، پیـی راگـەیاندوم کـە ئـەو هەوالانـەی لـیرە دیـنو دەچـن سـەبارەت بـە جولانـەوە دوشمنکارانەکەی شیخ عوبەیدوالله، هیچ بناغەیەکیان نیـە، بـەلام ئـەوە راسـتە کـە هەمزاغا، دوای ئەوەی لە سابلاخەوە هات، ریی کرد بۆ نوچێو، لەوانەیە هیشتا لەگـەڵ شیخ دا بیت. کۆنسۆلە گشتیەکەی تورکیا هـەروەها گوتـی، ئەحمـەداغای مامش بەو

دواییانه سەردانی شیخی کردوە، بەڵام دوای ئەوەی گەراوەتەوە بۆ سنوری ئیرانیو، لەو باوەرەشدا بو کە شیخ عوبەیدوالله کە عەبدوالقادری کوری تا ئەو دواییانەش لە ورمێ بوە، پەیوەندیەکانی لەگەڵ حکومەتی ئیراندا، هیشتا دۆستانەو باشە.

## هاوپیچی ٤ی ژمارە: ٧٧

### لە ئابۆت ی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆ مستەر تۆمسن

بەریز، تەوریز، ٢٧ك١، ١٨٨٠.

کە ٢٤ی ئەم مانگە لە سابلاخوە گەیشتە ئیرە دەلیت، کورەکەی شیخ عوبەیدوالله لە شنۆ بوەو، کۆمەلیك لەسەرۆکە کوردەکانیشی لی بوە، بە هەمزاغاو ١٥٠ کەسی تریشەوە لە هەمو بەشەکانی کوردستانەوە، هەموشیان سویندی دلسۆزیان (ولاء) بۆ شیخ خواردوە.

هەواڵ هاتوە کە بنەمالە ئەرمەنیو روسیەکان سابلاخ جی دیلن، بۆ ئەوەی لە حالەتی هوروژمیکی کورداندا لە مەترسیەوە دوربن. باوەر ناکریت شیخ بەراستی نیازی پیشرەویکردنی هەبیت بۆ سەر سنوری ئیرانی، لەوانەیە بابی عالی بەشتیکی گونجاوو بەسودی بزانیت کە دان بە شیخدا وەك سەرۆکی میللەتی کورد بنیت، بە مەرجیك بتوانیت زەمانەتی راگرتنی نیزام لەناو خیلەکاندا بکاتو باجو خەراجی سالانەی تەواویش بە سولتان بدات. لەلایەکی تریشەوە، لەوانە نیە بە تەواوی پیش بینیەکی ناراست بیت کە شیخ لە ئاکامدا بخوازیت خۆی لە فەرمانرەوایی تورکی لابدات، یان ئەو گوشارەی لە ئەوروپا خراوەتە سەر بابی عالی، دۆخیکی وای هیناوەتە کایەوە، کە بەهۆیەوە تەرەفەکەی بەرامبەر بخوازیت گۆرانکاریەك بخولقینیت.

## هاوپیچی ٥ی ژمارە: ٧٧

### لە ئابۆت ی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆمستەر تۆمسن

(هەلبژاردە) ورمێ، ٧ی ت١، ١٨٨٠.

بە گەیشتنم بۆ ورمێ لە ٢ی ئەم مانگەدا، یەکەم هەواڵ کە پیم گەیشت ئەوەبو کە لەشکریکی گەورەی کوردەکان، بە فەرماندەیی شیخ عەبدوالقادر، یەکیکە لە کورەکانی شیخ عوبەیدوالله- لەشنۆوە پیشرەویی کردوە بۆ سولدوز، لەوێ هیزیکی قەرەپاپەکانو کوردەکانی مامش بەرەنگاریان بونەتەوە، بەلام کە دەبینن بەرگریکردن بێ هودەیە، مل بۆ شیخ دادەنەوینو دەدەنە پاڵ لەشکرەکەی. حاکمی سولدوز زەخیرەی پیویستی بە لەشکرەکەی شیخ داو، ئینجا روەو سابلاخ کەوتنەرێ. کاتیك شازادە (میر)- حاکمی شارەکە، نزیکبونەوەی هوروژم هینەرەکانی بیست، هەر ئەو

ساته دەرچو بۆ تەوریز. بەو جۆرە کوردەکان بەبێ بەرەنگاریکردنی دانیشتوانەکان، چونە ناو سابلاخو هەروەها زەخیرەشیان درایە. پاشان شیخ لەگەڵ لەشکرەکەیدا، کشان بۆ میاندواو.

مەسیحیەکانی دانیشتوی سولدوز، لەلایەن کوردەکانەوە سەغلەت نەکرانو، لەو کاتەشەوە دەستیان لە خراپ مامەلەکردنی دانیشتوانە شیعەکانی سەر ریگاکەیان دەپاراست.

دوینێ لیرە هەوالی ئەوە هەبو کە چەند پەیامبەریك کە شیخ عەبدوالقادر ناردبونی بۆ زەخیرەو پرسین لە نیازی دانیشتوانەکان، سەربردراون لەلایەن ئەمانەی دواوە (دانیشتوان)، شیخیش بەمە کەللەیی بوەو بەپەلە لەگەڵ لەشکرەکەیدا هەلی کوتاوەتە سەر میاندواو، شارەکەی تالان کردوەو دانیشتوانەکەشی بەکۆمەڵ کوشتوە. لەلایەکی تریشەوە، واتەواتیك بوە کە سولەیمان خانی ئەفشار بەهیزیکی چار دەولەوە لە میاندواو لەگەڵ کوردەکاندا کەوتۆتە شەرو، هەردولا زیانی گەورەیان لیکەوتوە، بەڵام لە ئاکامدا عەبدوالقادر لەگەڵ لەشکرەکەیدا کشاونەتەوە بۆ سەر سابلاخ.

بەم دواییانە، نەستۆریەکی پروتستانت لە گەورەوە هاتۆتە ئیرە، دەیگەیەنیت کە ژمارەیەکی زۆر لەسەردارو خیلی کورد لەو ناوچەیەدا کۆبونەتەوە. ئەمانە لە هەمو بەشیکی کوردستانەوە بەدەوری بەیداخەکەی شیخ عوبەیدوالللەدا کۆمەلەیان کردوە، چونکە شیخ لەریگەی یەکیك لە ئەفسەرە ئەساسیەکانیوە کە نامەکانی بۆ ئەو مەبەستە بلاوو دابەش دەکات، بانگهیش کردبون.

دوابەدوای گرتنی سابلاخ، قەلاکەی لاهیجان تەسلیم بە کوردەکان بو، لە ئەنجامدا تۆپەکانیان لەکارخستو پادگا ئیرانیەکەشیان بە ۲۰۰ دیلەوە گرت.

راگەیەندراوە کە نەخشەکەی شیخ عوبەیدوالللە پەلاماردانی ئیرانە بە سێ لەشکری جیاوە. یەکەم لەشکر دەنیردریتە سەر خۆیو سەلماس؛ دوەم بۆ سەر مەرگەوەرو ورمێ؛ سییەم یش بۆ سەر سابلاخو تەوریز.

حالی حازر، ورمێ لەژیر هەرەشەی لەشکریکی کوردەکاندایە بە فەرماندەیی شیخ سادق. ئەم هیزە، لەنیرگی، لەنزیك دەشتی مەرگەوەر، بەدوری ۲٤ میل لەم شارەوە بارگەی لیداوە. هیچ شتیك نیە رێ لە شیخ سادق بگرێ بۆ کشانو داگیرکردنی ورمێ. ئەو هیزانەی کە لەبەر دەستی ئیقبال الدولەدان بەناو دو فەوجن، بەڵام لەناوچەکەدا پەرشو بلاوبونەتەوەو، گەر کوردەکان لەپر پەلاماری ورمێ بدەن، زۆر زەحمەتە حاکمەکە بتوانیت بەرگری بکات. ناتوانیت بەهەموی، زیاتر لە ۷۰۰ کەس کۆبکاتەوەو، ورمێ یش بیگومان هەمان چارەنوسی سابلاخی دەبیت.

لەگەڵ ئیقبال الدولـەدا، کە لـە دەرەوەی شـار بارگـەی لیـداوە، دیداریکم کـردوەو، داوای پیویستی ناردنی بروسکەم لیکرد بۆ تەوریز، بۆ سازدانی هیزی تازە.

بیگومان وەلیعەهد ئەم دۆخە پر مەترسیەی کە هەرەشـە لـە سـەلامەتی دەسـەڵاتی حکومەتەکەی دەکات، بەشا گەیاندوە؛ چونکـە ئەگـەر حکومـەتی ئیران ئامـادە نـەبیت هیـزی تـەواو بهینیتـە نـاو مەیدانەکـەوە بـۆ بـەرەنگاریکردنی لەشـکری کوردەکـان لـە میاندواو، وا شیخ عەبدوالقادر بەردەوام دەبیت لەکشان بەرەو تەوریز.

لە نامەکاریەکانی پیشومدا لەگەڵ بەریزتانو وەزارەتی دەرەوەی حکومەتی خاوە شکۆدا، بە بەردەوامی ئەو مەترسیەم رونکردۆتەوە کە بۆ حکومەتی ئیرانو دانیشتوە مەسیحیەکانی ئـەم ناوچانـە پـەیدا دەبیـت، ئەگـەر ریگـە بەشـیخ عوبەیدواللـە بدریـت ببیتە خاوەن نفوزی بێ سنور لەناو هۆزە کوردەکانی نیو سنوری ئیراندا؛ بـەڵام لـەوە نـەدەچو حکومـەتی ئیران بـەوەی زانیبیـت کـە مەترسـیەکە نزیکـە. ئیسـتا شـیخ هیـچ نهینیـەکی لـە نیازەکـانیدا نەهیشـتوە. پرۆژەکـەی ئەوەیـە کـە خـۆی بەسـەرۆکی ئـەمارەتیکی کـوردی دابنیـتو، هـەمو کوردسـتانیش لـە تورکیـاو ئـیراندا، بلکینیـت بەیەکەوە.

## ژمارە: ٧٨

لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ مستەر St جۆن

بەریز، وەزارەتی دەرەوە، ٧ی ك٢، ١٨٨١.

نامـەی ٢٢ی مـانگی رابوردوتـانم پـێ گەیشـت، بـە تەرجەمـەی یاداشـتیکو هاوپیچەکانیەوە، کە موحسین خانی سەفیری ئیرانی لـە ئەستەموڵ، ئاراستەی هیزە ناوبژیکـەرەکانی کردبوو، داوای بەگەرخستنی نفوزیـانی کردبـو بـۆ تەئسـیرکردن لـە بابی عالی، تا هەنگاو بنیت بۆ ریگەگرتن لە شیخ عوبەیدواللە، کە ئیستاکە لە ناو خاکی تورکیادایە، سنوری ئیران نەبەزینیت.

پیـش گەیشـتنی هیـچ وەڵامیـك بـۆ ئـەم داواکاریـە، حکومـەتی خـاوەن شـکۆ پیخۆشحاڵ دەبیت بزانیت، گەر سەفیری روسی هیچ کاریکی کردبیت بۆ پشتیوانی لیکردن لەو گازەندانەی سەفیری ئیرانی دەربارەی ئەم مەسەلەیە بۆی کردوە.

(ئیمزا) گرانڤیل

بە بروسکە نیردراوە

## ژمارە: ٧٩

لە مستەر. St جۆن وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ١٤ی کانونی دوەمدا گەیشتوە)

(بە بروسکە) ئەستەموڵ، کاتژمیری ٨,١٠ دوای نیوەرۆی ٨ی ك٢، ١٨٨١.

ئاماژە بە بروسکەکەی دوینێی جەنابتان، سەفیری روسی پیی راگەیاندم کە، لە چەندین بۆنەدا پشتگیری لەسەفیری ئیرانی کردوە لە گازەندەکانیدا سەبارەت بە پەلاماردانی کوردەکان. هەروەها دەیگوت، کە پیویستە لەو پشتگیریکردنەی بەردەوام بیت.

## ژمارە: ٨٠

**لە مستەر St جۆن وە بۆ ئیرل گرانڤیل- (لە ١٤ی ك٢دا گەیشتوە)**

گەورەم، ئەستەموڵ، ٤ ك٢، ١٨٨١.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هاوپیچ کۆپی نامەکانی جیگری کۆنسوڵی گشتی حکومەتی خاوەن شکۆ لەوان، دەربارەی مەسەلەی هوروژمی کوردەکان بۆ ئیرانو، واتەواتی پیکهاتنی کۆمەلەیەکی کوردی، بۆ جەنابتان رەوانە بکەم.

(ئیمزا) ف. ر. St جۆن

## هاوپیچی ١ی ژمارە: ٨٠

**لە کاپتن کلایتن وە بۆ مەیجەر ترۆتەر**

بەریز، وان، ٢٣ی ت٢، ١٨٨٠.

هەوالی باوەرپیکراو گەیشتوە، ئەوە رادەگەیەنیت کە هوروژمی کوردەکان بۆ ئیران، ئیستا بە تەواوەتی لەناوچوە. کوردەکان زۆر خراپ لەلایەن هیزەکانی ئیرانەوە تیکشکینراونو بەهەمو لایەکدا بلاوەیان لیکردوە، بە تەنها چەند سەد کەسیکیان لەگەڵ شیخ عوبەیدوالله، عەبدوالقادری کوری ماون. هەردو ئەمانە، پیدەچێ لە دۆخیکی زۆر وریایی دابن. چەند رۆژیکی کەم لەمەوبەر هەواڵ هەبو، کە شیخ عوبەیدوالله گەراوەتەوە بۆ مالەکەی خۆی لە شەمدینان، بەلام پاشان هەواڵ گەیشتو هەندێ گومانی هاویشتە سەر ئەمە.

واباسدەکریت کە تورکەکان ریگەی پێ نادەن بگەریتەوە ناو ولاتەکەیان لە ترسی ئەوەی توشی فەزیحەو مەترسی نەبن. بەهەرحاڵ، ئەو (شیخ) لە شوینیکە، نزیك سنورو، عەبدوالقادریش لە شوینیکە لەنیو عەشایەرەکانی باشوری دەریاچەی ورمێ. ئیمرۆ، نامەیەکم پیشاندرا، میسیونیرە ئەمریکاییەکانی ئیرە لەیەکیك هاوریکانیان لە ورمێوە پییان گەیشتوە، دەلیت، بۆ حەفتەیەك ورمێ لەلایەن شیخەوە گەمارۆ درابو و، لەو ماوەیەدا شەر هەر بەردەوام بوەو بەنزیك بونەوەی هیزە تازەکانی ئیران دۆخەکە باش بوە. پیدەچێ یاخیبونەکە بوبیتە جەنگیکی ئایینی (دیارە

مەبەستی مەزەبییە– وەرگێر) نێوان سوننیو شیعەو کاری نارەواو خراپەکاریو کۆمەڵ کوژی لەلایەن هەردو لاوە ئەنجام دراوە. من وای بۆ دەچم کە مەسیحیەکانیش لێی بەدەر نەبون.

هەواڵ لە باشقەڵاوە هاتوە کە هێزەکانی تورك بەخێرایی دەگوێزرێنەوە بۆ گەوەر، بۆ پاراستنی سنور هەم لە کوردەکانو هەم لە ئێرانیەکان کە راویان دەنێن. بەڵام واباسدەکری کە ژمارەیەکی زۆر لەکوردی هەڵاتو کە زۆر گوندی مەسیحیەکانی گەوەریان تاڵان کردوە، هاتبێتنە سەر سنور، لەبەر ئەوە دانیشتوانەکان هەڵاتون بۆ باشقەڵاو؛ گازندەو سکاڵای ئەوەش هەیە کە هێزەکانی تورکیا ئەوەندەی کوردەکان خراپن.

بەگشتی، من لەو باوەرەدا نیم جاریکی تر وا زو لە داهاتودا، شتیکی چاوەروانکراو بیت کە شیخ ئەوەندە بەهیزو شوین مەترسی بیت.

(ئیمزا) ئیمیلیەس کلایتن

## هاو پێچی ۲ی ژمارە: ۸۰

### لە کاپتن کلایتن وە بۆ مەیجەر ترۆتەر

(هەلبژاردە) وان، ۲۷ی ت۲، ۱۸۸۰.

ئاماژە بەداواکەت بۆ زانیاری زیاتر کە بتوانریت وەدەست بکەوێ، سەبارەت بە واتەواتی پیکهینانی کۆمەلەیەکی کوردی، من لەو باوەرەدانیم شتیکی لەو جۆرە وەك کۆمەلەیەکی کوردی بتوانرێ باس لە بونی بکریت، گەر مەبەست لەوە یەکیتیەکی تاوتویکراوی سەرۆکەکانو هۆزەکان بیت بۆ ئامانجیك کە لای هەموان درك پیکراوو مەبەستە. من وای بۆ دەچم کە ئەوەی رویداوە، ئەمەبوە. شیخ عوبەیدوللە، بەهۆی ناو شۆرەتی لەروی پاکیو لەخواترسیەوە، بەهۆی توانای شەخسیەوە، وە بەهۆی حەماسەتی لایەنگرەکانیەوە، توانی نفوزیکی زۆر فراوانو بەرین بەسەر کوردەکاندا وەدەست بهینیت.

لەبەر ئەوە، سەرخیلو هۆزە جۆراو جۆرەکان ئامادەبون گوێ رایەلی فەرمانەکانی بکەن، هەرچیەك بوبیتن، لەلایەکەوە بەهۆی ئەم نفوزەوە رایکیشابون، وە لەلایەکی تریشەوە بەهیوای تالانی.

بەباوەری من، بەم جۆرە، لەکاتیکدا شیخ خۆی، ئامانجو نەخشەی زۆر سنوردارو ئاشکرای هەبو، کوردەکان بەشیوەیەکی گشتی، زۆر کەم دەیانزانی بەچ پرۆژەو کاریکەوە خەریکن، هەرچەندە گومان لەوەدا نیە کە وروژاندنو هەستیکی زۆر

لەناویاندا بەگشتی خولقیندرا بەو واتەواتانەی کە لەئارادابون سەبارەت بەو امتیازاتانەی درابو بە ئەرمەنیەکان؛ وە گریمانیکی زۆریش هەیە کە شیخ سودی لەمە وەرگرتبیتو، دەستنیشانی پیویستی یەکیتی نیو کوردەکانی کردبیت بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خودی خۆیان.

من تەواو دلنیام کە ئامانجو نیازی شیخ یەکگرتنی هەمو کورد بوە لە هەردو خاکی تورکیاو ئیراندا، بۆ ئەمارەتیکی سەربەخۆ یا نیمچە سەربەخۆ بەسەرۆکایەتی خۆی. هەلومەرجەکان وایان لیکرد کە یەکەم جار بایەخ بە دیوی ئیران بدات، لەوانەیە بەزۆری بەهۆی ئەو سەرنەکەوتنە زۆرەی تەقەللاکەی دژی حوکمی عوسمانی لە سالی پاردا، بوبیّو، هەروەها بەهۆی ئەو بۆچونەی بلاوبو دەربارەی لاوازیی ئیران. ئەو هەروەها لەوانەیشە، لە دەستپیکردنیدا، لەگەڵ ئیراندا، وای بۆچوبیت کە گریمانی هەراسانکردنو تورەکردنی دەولەتە ئەوروپاییەکان کەمتر بوە. بیگومان ئەو بەهیوابو کە پیشەکی ئەو دەسەلاتی نیمچە سەربەخۆییە لە حکومەتی ئیرانی بستینیت کە عەبدوالقادری کوری ئیستاکە هەیەتی بەسەر خیلە کوردەکانی باشوری دەریاچەی ورمیّدا. من لەو باوەرەدام، ئەگەر ئەو لەمەدا سەرکەوتو بوایە، ئەوا دوای جیگیر کردنی دەسەلاتی بەسەر دیوی ئیراندا، لای ئەکردەوە بۆ وەدەستهینانی هەمان شت سەبارەت بە کوردەکانی تورکیا لە حکومەتی عوسمانی. شتیکی بەلگەنەویستە کە نیردراوەکانی لە هەمو لاکاندا سەرقاڵ بون، هەولی راکیشانی نەك تەنیا هەمو خیلە کوردەکان، بەلکو هەروەها نەستۆریو ئەرمەنیەکانیشیان ئەدا. لەنامەکانی پیشومدا، باسی دەست پیشخەریەکانیم کردوە بۆ نەستۆریو ئەرمەنیەکان؛ وە سەمیح پاشاش دوینیّ پیی راگەیاندم کە نامەی شیخ عوبەیدوالڵەی دەستکەوتوە، کە نوسیونی بۆ زۆر لە خیلە کوردەکان، داوایان لیدەکات بدەنە پالیو، دەشلیت حکومەتی تورکی گفتی چەكو تەقەمەنی پیداوە. بەلام سروشتی سەربازگیریەکەی لەیەك ترازانیکی کوشندەی بۆ دروست کرد. لە هەوەڵ کۆدا، بیگومان ژمارەیەکی زۆر لە خەلکی دایانە پالی بۆ ئەوەی شتیّ زیاتر تالانی بکەنو، کاتیکیش ئەوەندەیان دەسکەوت کە ویستیان، جیابونەوەو رۆیشتن، وە ریزو هەیبەتو نفوزیش بەس نەبون بۆ هیشتنەوەی ئەوانەی کە مابون بەیەکەوە، کاتیك پیشرەویە سەرکەوتوانەکەی وەستینرا– چونکە کورد وەك خەسلەتیکی گشتی، رەگەزیکی زۆر ئازاو کەللە رەق نین، بەلام چۆن بەئاسانی تەفرە ئەدرین، هەر ئاواش بەئاسانی دەترسینرینو، سەرباری ئەوەیش ئەو شتانەیان نیە کە پیویستن بۆ بەردەوام بونی شالاویکی پر کیشەو ململانیّو دریژخایەن.

لەبەر ئەوە، من لەو باوەڕەدام کەمەترسیەکی کەم هەیە کە جوڵانەوەیەکی گرنگی یەکگرتوی تر لەناو کوردەکاندا جاریکی تر تا ماوەیەك روبدات، چونکە تەنها کەسیك کە توانی یەکیان بخات، بەم شیوەیە بە ئاشکراو رون فەشەلی هینا. بەڵام، بیگومان، خیلە زۆرو جۆراوجۆرەکان دەتوانن ئازارو زیانیکی زۆر گەورە بە دانیشتوانە نیشتەجیّو بیّوەیەکانی وڵاتەکە بگەیەنن، لە نەبونی ریو شوینی تەواوو گونجاودا لەلایەن حکومەتەوە بۆ دابین کردنی ئارامی.

کاربەدەستە تورکەکان پییان راگەیاندم کە شیخ گەراوەتەوە شەمدینان، هیزەکەی بە تەواوی بڵاوەی کردوەو، ژمارەیەکی زۆریش لە راکردو لەو دیو سنورەوە هاتون بۆ ئەوەی لە دەست هیزەکانی ئیران کە کاری نارەواو تەجاوزی زۆر خراپ دەکەن، دەربازبن. کاربەدەستە تورکەکان دالدەی ئەم کوردە هەڵتوانە دەدەنو، وەك سەمیح پاشاش پیی راگەیاندوم، بەنیازن بەشیوەیەك بروانن حەملەکەی شیخ، کە هاوشیوەیە لەگەڵ ئەو پەلامارە بەردەوامانەی خیلە ئیرانیەکان دەیکەن بۆ سەر ئەم دیوی سنورو، هەمیشەش کە دەگەرینەوە خاکی ئیران دەپاریزرین، ئەگەرچی ئەم سەرکیشیەی ئیستا وەك پاشا خۆیشی تیبینی کردوە، لەسەر مەودایەکی زۆر گەورەتر بوە. لەوە ناچیت، وەك چاوەروان دەکرا، هیچ نیازیك هەبیّ بۆ رەخساندنی هەلو هەنگاو نان بۆ دابین کردنی ئارامی خودی خۆیان لە داهاتودا.

## ژمارە: ٨١

لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ ئیرل دەفەرین

گەورەم، وەزارەتی دەرەوە، ٢٨ك٢، ١٨٨١.

لەنامەیەکی M. de Giers دا کە سەفیری روسیا لە ٢٥ی ئەم مانگەدا بۆ منی خویندەوە، بەریزی تیّبینی لەسەر هوروژمی کوردەکان بۆ ناو ئیراندا. دەیگوت، پیویستە حکومەتی خاوەن شکۆ لەم کاتەدا، لە مەترسی دەست تیوەردانی روسیا لە ململانیکە، دلنیا بکریتەوە. بەوەی کە روسیا نەگەراوە بەدوای هەلەکەدا بەلکو بەوەی گەر ئینگلستان بخوازیت لەداهاتودا خۆی لی بپاریزیت، پیویستە لەگەڵ روسیادا ریگە لە دوبارە بونەوەو گەرانەوەی ئەم پشیویانە لەسەر سنور بگرن، کە لەوانەیە دەرئەنجامی ترسناکی لی بکەویتەوە. هەلویستی گوماناوی بابی عالی سەبارەت بە جوڵانەوەی کوردەکان کاریگەریەکی خراپی لەتاران پەیدا کردوە. لەسەردەمی پیشودا، ناوبژیکردنی بەیەکەوەی روسیاو ئینگلستان سەرکەوتو بوە لەریگەگرتن لە کیشەو ململانیّی نیوان تورکیاو ئیراندا. رەنگ ئیستایش هەمان ئەنجامی هەبیتو

نیزامو ئاشتی بگەریتەوە ناو ولاتە پر ئاژاوەکان. حکومەتی روسیا، بەش بەحالی خۆی، هیچ ئامانجیکی تری نیە.

بەمیر لۆبا نۆف م راگەیاند، کە ناتوانم هیچ وەلامیك لەسەر ئەم مەسەلەیە بدەمەوە، گەر لەگەلْ هاوریکانمدا راویژ نەکەم، بەلام لەو باوەرەدام کە ئەو فیکرەیەیان بەچاك زانیبیت کە، ئینگلستانو روسیا لە تەقەللایاندا بۆ ئارامو ئاسایی کردنەوەی دۆخی ئەم ولاتانە، بەیەکەوە کاربکەن وەك لەوەی دژ بەیەك بن.

(ئیمزا) گرانڤیل

## ژمارە: ٨٢

### لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل

### (لە ٣١ی کانونی دوەمدا، بە بروسکە وەرگیراوە)

گەورەم، تاران، ٣١ی ك٢، ١٨٨١.

دوینیْ وەزیری کاروباری دەرەوە، دو بروسکەی بۆ خویندمەوە، کە هەر ئەوساتە گەیشتبوە دەست حکومەتی ئیران لە کاربەدەستەکانی سنور، لەخۆیەوە، دەیگەیەنن کە جاریکی تریش شیخ عوبەیدوالله بەفعلییو چالاکانە خەریکی خۆ ئامادەکردنو سازدان بوە بۆ دەستپیکردنەوەی کاری دوشمنکارانە لەگەلْ ئەم ولاتە، وە حکومەتی تورکیش هیچ هەنگاویکی نەناوە بۆ ریگەگرتن لی لە کۆکردنەوەو سازدانی لەشکرو کرینی چەك بۆ ئەو مەبەستە.

میرزا سەعید خان دەیگوت، شا خواستویەتی کە داوا بکەم ئەم هەوالە بگەیەنمە جەنابتانو، بلیم ئەگەر بابی عالی رازی نەکریت ریو شوینی کاریگەر بگریت بۆ وەستاندنی (کبح) شیخو کورەکانی، ئەوا گریمانیگی زۆر دەبیت کە لە بەرهاردا هوروژمیکی نویْ لە تورکیاوە بۆ ناو ئیران روبدات.

ئیران، تاکو ئیستا نەیتوانیوە رەزامەندی بۆ داواکاریە مام ناونجیەکانی (معتدل) سەبارەت بە گواستنەوەی شیخ عوبەیدوالله لە سنور، وە بۆ تەسلیم کردنەوەی ئەو سەرۆکە ئیرانیانەی کە لە سەرهەلدانەکەی دواییدا بەشداریان کردبو، بەدەست بهینیت، لەبەر ئەوە شا رونی کردەوە کە بەردەوام بون لەسەر جەخت کردن بۆ ئەم داواکاریانە لەحالی حازردا، کات بەفیرۆ دانە. تەنها دوپات کردنەوەی ئەو بەلینە نادیارانەی لی دەبیتەوە کە تورکیا تا ئیستا داویتیو هیچ ئەنجامیکی عەمەلی لی پەیدا نابیتو، شیخ عوبەیدوللەش لەم کاتەدا خۆ ئامادەکردنو سازدانی تەواو کردوەو شەرو دوشمنکاریەکانی دەستپیکردۆتەوە.

رای شا ئەوە بو کە مادام هیشتا وەخت ماوە، کاری ژیرانە تر لەوەدایە هەولی وەدەستهینانی ئەو زەمانەتە بدریت کە بابی عالی هەندێ ریوشوینی کاریگەر بگریت بۆ ریگەگرتن لە شیخ عوبەیدوالله، جاریکی تر بەهیزیکی چەکدارەوە نەچیتەوە ناو خاکی ئیران. لەم روانگەیەشەوە بە بروسکە ئامۆژگاری نیردرا بۆ سەفیری ئیران لە ئەستەموڵ تاواز لە داواکاریەکان بهینیتو، ئیستاش هانی حکومەتی تورکیا بدات بۆ ئەوەی بە نوسین تعهدیکی رەسمی بداتو، ئەوە بخاتە ئەستۆی کە ریگە بەهیچ هیزیکی چەکدار نەدریت لەهیچ بەشیکی خاکی تورکیا بچیتە ناو ئیرانەوە.

وەزیری کاروباری دەرەوە هەروەها وتی، شا زۆر بەجدی داوایکردوە کە حکومەتی خاوەن شکۆ لەریگەی کۆنسۆلە خۆش مەعشەرەکەیانەوە لە ئەستەموڵ، پشتگیری لەو داوایە بکات کە ئامۆژگاری حاجی موحسین خان کرابو بۆ وەدەستهینانی ئەم تەعهدە، ئاراستەی بابی عالی بکات.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## ژمارە: ٨٣

**لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل**

**(لە ٢١ی شباط دا، بە بروسکە گەیشتوە)**

(هەلبژاردە) تاران، ٢ی شباط، ١٨٨١.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە بۆ زانیاری جەنابتان ئەوە رابگەیەنم کە لە دیداریکی تایبەتیدا کە دوینێ کردم، گفتوگۆیەکی دورو دریژم لەگەڵ شادا کرد، سەبارەت بە نەستۆریەکانی ورمێو ئەو هەلویستە دوشمنکاریانەی شیخ بۆ جاریکی تریش لەم دواییانەدا لەسەر سنوری ئیران پیشانی داوە.

بۆ قسەکردن لەسەر مەسەلەکەی دواوە، شا دەیگوت لە بروسکەکانی میرزا رەزا خان– ئەفسەریك بوە سوپاسالار ناردویەتی بۆ وان، کە گەیشتونەتە حکومەتی ئیران، وا دەرکەوتوە کە شیخ عوبەیدوالله لەشکری کۆکردۆتەوەو بە ئەفسەری کەم دەرەجەوە (صغیر– ثانوی) کەهەتا ئەو دواییانەش خزمەتی حکومەتی تورکیان کردوە، راهینراون؛ چەکو تەقەمەنی لەو فەرمانبەرە ناونجیە تورکانە کریوە، کە گوایە بەشیوەیەکی نهینی لە ئەمبارەکانی حکومەتەوە دەستیان کەوتوە؛ ئەم خۆسازدانو ئامادەکردنانەش بە ئاشکراو بەدان نان بە نیازی پەلاماردانیکی نوێ بۆ خاکی ئیران، ئەنجام دراون؛ وە حکومەتی تورکیاش بە تەواوی بەکردارەکانی شیخ عوبەیدوالڵەی زانیوە، کە سەرباری ئەوەش هیچ هەنگاویکی نەناوە بۆ ریگەگرتن لییان، یان

وەستاندنیان. ئیران بی هودە هەولی‌داوە زەمانەتیکی لەبابی عالی‌وە دەستکەویت، کە بتوانیت بەهۆیەوە دلنیا بیت لەوەی هوروژمیکی نویٚ لە تورکیاوە ناکریتەوە ناو خاکەکەی. داواکاریەکەی بۆ دورخستنەوەی شیخ عوبەیدوڵڵەو کورەکانی لەسنورو بەدەستەوەدانی سەرۆکە یاخیبوە ئیرانیەکان جیبەجی نەکرا، وە ئیستاش حکومەتی ئیرانی بریاری داوە کە داوای تعهدیکی نوسراو بکات، بۆ ئەوەی لە داهاتودا ریگە نەدریت بەهیچ هیزیکی چەکدار لە تورکیاوە بچیتە ناو خاکی ئیرانەوە. خاوەن شکۆ دەیگوت، ئەگەر ئەمانە رەفز کران، ئەوا شتیکی ئاشکرایە کە بابی عالی کردارەکانی شیخ عوبەیدوڵڵە پیٚ باشەو هانی ئەدا، وە ئیرانیش لە راستیدا مامەلەی لەگەڵ یاخیبوە کوردەکاندا نەکردوە، بەلکو لەگەڵ حکومەتی تورکیادا، کە فەرمانبەرەکانی خەریکی ریکخستن‌و هاندانی عملیاتی دوشمنکارانەن دژی ئەم وڵاتە.

هیوای وابو کە حکومەتی خاوەن شکۆ هانی بابی عالی بدات تا پیشنیازەکەی قوبوڵ بکاتو، لەو باوەرەشدا بو کە سولتان ناتوانیٚ داواکەی رەفز بکات گەر ئینگلستان‌و روسیا فشاری بخەنەسەر، چونکە هیزی ناو بژیکەرن‌و لەم کاتەشدا ئۆفیسە چاکەکانیان بەشیوەیەکی نەگۆر بەکارهیناوە بۆ چارەسەرکردنی هەمو کیشەو گرفتەکانی سنور لەنیوان دو دەولەتە موسولمانەکەدا.

بەخاوەن شکۆیم راگەیاند کە پیشتر داواکەیم لەسەر ئەم مەسەلەیە بە بروسکە بە حکومەتی خاوەن شکۆ گەیاندوە، بەلاّم من لەو باوەرەدابوم کە، لەکاتیکدا حکومەتی ئیرانی هەولی ئەدا سەبارەت بە کردارەکانی شیخ عوبەیدوڵڵە بگاتە تیگەیشتنیك لەگەڵ بابی عالی‌دا، پیویست بو ئاگاداری ئەوەش بن، کە بە جۆریك خۆیان ئامادە بکەن کە بتوانن بەرپەرچی هەر هیرشیك بدەنەوە کە لەوانەیە بیکاتە سەریان.

## ژمارە: ٨٤

لە مستەر تۆمسن وە بۆ ئیرل گرانڤیل- (لە ٤ی شباط ی١٨٨١ وەرگیراوە)

گەورەم، تاران، ٢٣ی ك١، ١٨٨٠.

لە دیدارەکەمدا لەگەڵ شا، لە ١٩ی ئەم مانگەدا، خاوەن شکۆی بە تایبەتی داوای لیکردم کە چەند دۆکیومینتیکی دیاریکراو لەوانەی کەوتبونە ناو دەستی لەشکرەکانی ئیرانەوە کە خەریکی دامرکاندنەوەی سەرهەلدانی کوردەکان بون، بۆ جەنابتان بنیرمو، بەهۆی ئەوەی سوپاسالار ئەم دۆکیومینتانەی رەوانەی تاران کردبو، وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ هەمو وەفدە (بعثە- وفد- منتدب) جۆراوجۆر بیگانەکانی ناردبو. (دیارە مەبەستی سەفارەتەکانە)

ئەم دۆكیومینتانە، كە ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە هاوپێچ تەرجەمەكانی بنێرم، ئەوە ئەمانەن كە ئاراستەی شێخ عوبەیدوالله كراون لەلایەن هەمزاغا، عەبدوالقادری كوری، وە كابرایەكی فەرەنسی بەناوی ئەلیكساندەر رەینارتوە. بێگومان، ئەو زانیاریانەی تیایاندایە چیتر شوێن بایەخو گرنگی نین، بەڵام خاوەن شكۆی بەتایبەتی دەخوازێت كە جەنابتان سەرنجی شێوازو، ئەو ناونیشانە بدەن كە ئاراستەی شێخی پێ كراون، وە هەر ئەوانەن كە بەعادەتی لە ئێراندا بەكار دەهێنرین، كاتێ نامە بۆ شا خۆی دەنوسن. خاوەن شكۆ ئەمە وەك بەلگەیەك دەهێنێتەوە كە ئامانجەكانی شێخ چەند (گەورە) بون، وەكو ئیدعای ئەو لەقەبانە دەكات بۆ خۆی لەسەر خاكی ئێراندا كە تەنها هی فەرمانرەوای وڵاتەكەیە.

(ئیمزا) رۆنالد ف. تۆمسن

## هاوپێچی ١ی ژمارە: ٨٤

نامەی ئاراستەكراو بۆ شێخ عوبەیدوالله

(تەرجەمە) لە هەمزاغای مەنگورەوە بۆ شێخ عوبەیدوالله

ماوەی دو رۆژە ئێمە لەشاری بنە شەر دەكەینو، بە تەواوی گەمارۆی شوێنەكەمان داوە، بۆ ئەوەی هیچ كەسێك نەتوانێ لە قەڵاكە دەرچێ. ئومێدەوارم خوای گەورە سەركەوتنمان مسۆگەرو لەشكری دوژمنیش وەك تۆوی خەشخاش بڵاوە پێ بكات.

بە گەیشتنی ئەم نامەیە، لەپایەبەرزتان دەخوازم بە خێرایی ١,٠٠٠ كەسو ئەوەندەی دەتوانرێت تفەنگی مارتینیو تەقەمەنیم بۆ بنێریت. من دلنیام لەوەی لە دوعاكانتا لەبیرم ناكەیت.

تێبینی– ئەو نازناوانەی لەو نامەیەی سەرەوەدا بەكارهێنراون، هەر وەك ئەوانەن كە ئاراستەی میریكی شاهانە دەكرین.

لە شێخ عەبدوالقادرەوە بۆ شێخ عوبەیدوالله

ئەز شەرەفی وەرگرتنی نامەكەی خاوەن شكۆتانم هەیە كە دابوتانە دەست مەلا حەسەنو، گەلێك خۆشحاڵ بوم بە بیستنی ئەوەی كە ورمێ گەمارۆ دراوە، دو تۆپ گیراوە، وە لەشكری موسولمانەكان سەركەوتونو خەلكەكەی ورمێش زۆر لەنارەحەتیەكانیان كەم بۆتەوە. تكامان وایە خوا سەركەوتنی خێراو تەواومان پێ ببەخشێ. ٢٠٠٠ سوارە دەنێرم بۆ لای خاوەن شكۆتان، كە شەوو رۆژ لە خزمەتتدا بن؛ سەركردەكانیشیان تعهدی دلسۆزیان (اخلاص) داومەتێ. هێزەكەی من لێرە

بچوکە، چونکە بە تەنها لایەنگرەکانی (لیرەدا نوسراوە پیاوەکانی) خان بەهاخان، هەمزاغاو، چەند خیلیکی کەمی دیگوری لی‌یە. دوژمن لەبەر دەممماندایە. گول عەلی ئاغا چۆتە سەریان، دەموچاوی رەش داگەراوە! پاش گرتنی ورمێ، تکایە ١,٠٠٠ کەس‌و تەقەمەنی پیویستم بۆ بنیرە. خۆشت بەخیرایی وەرە.

## نامەیەك ( ئیمزا نەکراوە ) ئاراستەی شیخ عوبەیدوالله کراوە

ئەو فەرمانانەی کە خاوەن شکۆتان بە لوتفەوە فەرموبوتان، بە تەواوی ریك‌و پیکی‌و لەسەرخۆ جیبەجێ کران. بەهیمەتی شیخی خاوەن شکۆی پیرۆز، یەك کەس چیە لەناو گوندەکاندا نەماون لەترسی سەربازەکان (پەلامارەدەرەکان- مغیر) خەلکەکە هەمو لە ترسا هەلاتون. مەحالە هەستی بەرزی دادوەری خاوەن شکۆتان ریگە بەو جۆرە کارانە لەو شوینانەدا بدات. کیلگەکانی برنج بێ خاوەنن؛ دوکانەکانی شارەکە تالان کراون. من ترسی ئەوەم هەیە کە لەوانەیە لەشکرە سەرکەوتوەکەی خاوەن شکۆت بەم کردارەی بۆ پیویستی زەخیرە، لەکەدار بیت. لەخوا داواکارم خاوەن شکۆت سەرکەوتوبیت! تکا لە خاوەن شکۆت دەکەم ٢٠ یان ٣٠ کەسم بۆ بنیریت تا مال‌و مولکەکەم بپاریزن. لیرە، زۆر سوارە هەن لە خزمەتی خاوەن شکۆتدا، بەلام گویێ رایەلی من ناکەن.

-تێبینی- ئەو نازناوانەی لە هەمو ئەم دو نامەیەدا بەکارهینراون، ئەوانەن کە ئاراستەی شا دەکرین.

## لە عەبدوالقادرەوە بۆ شیخ عوبەیدوالله

سەبارەت بە تیکشاندنەکەم لە بناب، هۆی ئەوەی کە سەرکەوتو نەبوم ئەوە بوکە هەندێ لە خەلکەکە لەگەل دوژمندا ریککەوتن. شەرەکە دو شەوو دو رۆژ بەردەوام بوو، بریار درا کە بکشیینەوە بۆ میاندواو بۆ ئەوەی سزای خیلی چەهار دولی بدەین. خوا یاربێ، ئیمرۆ دەگەینە چەهار دولی.

لەوە دەچێ ئەوانەی لە گەلمدان بیانەوێ بلاوەی لیبکەن‌و، منیش بۆ چەند رۆژیکە هەولئەدەم کارەکان ریکبخەمەوە. گەر نەترسن، بیگومان هەمو بلاوەی لیدەکەن. پیویستە جەهال خان قەرەپەپاك‌و اسماعیل ئاغا حاجی خوش حەپس کەین بۆ ئەوەی ببنە پەند بۆ خەلکی تر. پیویستە لەبارەی منەوە نامە بۆ هەندێ لەوانە بنوسیت.

ئەو خیلانەی لەگەل مندان، کۆنترۆلکردنیان گرانە

**له ئەلیکساندەر رەینارتی رەعیەتی فەرەنسیەوە بۆ شیخ عوبەیدوالله**

چەند سالیك لەمەوبەر، خاوەن شکۆتان لوتفتان فەرمو کە من بەیەکیك لەلایەنگرەکانتان دابنیین‌و ئەو دۆکیومینتەش کە دەرتان کردبو لەبەردەستدایە. من ئیستا خاوەنی گوندیکم، بەشیکی دانیشتوانەکەی‌موسولمان‌و بەشەکەی تریش مەسیحین؛ یەك شیعەیان لەناودا نیە. تکا بفەرمون خاوەن شکۆتان نامەیەکی ئیمزاکراو بۆ ئەو خەلکە بنوسن، بۆ ئەوەی لەشکرە سەرکەوتوەکەتان ئازارو زەرەریان پێ نەگەیەنن، وە هەموشیان دەبنە رەعیەتی دلسۆزی ئیوە.

## ژمارە: ٨٥

**له ئابۆت ی کۆنسوڵی گشتیەوە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٤ی شوباطی ١٨٨١دا گەیشتوە)**

گەورەم، تەوریز، ٣٠ ك١، ١٨٨٠.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە، کۆپی دو نامەو هاوپیچیك بۆ جەنابتان بنیرم، کە ئاراستەی وەزیری مفوض حکومەتی خاوەن شکۆم کردوە لە تاران، دەربارەی ئەو هەواڵە ناراستانەی لەسەر زەرەرو زیان گەیاندن بە مسیونیرە ئەمریکاییەکان بڵاوکرابونەوە، بەشداریکردنیان لەگەڵ شیخ عوبەیدوالله‌و ئەو ریو شوینانەش کە من دامنابون بۆ لابردنی ئەو بۆچونە نادروستەی پەیداببو، وە هەروەها بۆ پاراستنی ئەو پیاوانەو خیزانەکانیان.

دلنیام کە جەنابتان ئەو کارەی من لەسەر ئەو مەسەلەیە کردومە، دەسەلمینن.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپیچی ١ی ژمارە: ٨٥

**له ئابۆت ی کۆنسوڵی گشتیەوە بۆ مستەر تۆمسن**

(هەلبژاردە) تەوریز، ١٠ك١، ١٨٨٠.

لەماوەی گەمارۆدانی ورمێدا لەلایەن یاخیبوە کوردەکانەوە، میسیونیرە ئەمریکاییەکان کەوتبونە دۆخیکی زۆر گرانەوە. شیخ عوبەیدوالله لەگەڵ لەشکرەکەیدا لە دەرەوەی شارەکە، ریك نزیك بەخانوەکانی کۆلیجەکە بارگەی لیدابو، وە ئەوپەری ناژیری دەبو گەر میسیونیرەکان رەفتاریکی دوشمنانەی ئاشکرایان بەرامبەری بنوانایە، یان نەیانتوانیایە سود لەو هەستە دۆستانەیە وەربگرن کە پیشانی ئەدان. بەڵام لەهەمان کاتیشدا، ئاگاداری ئەوە بون کە بەلگەی وا قەناعەت

پیکەر بهیننەوە، بتوانن بیسەلمینن کە هەستیان بەرامبەر کاربەدەستە ئیرانیەکان زیاد لەهەمو کاتیك خۆشەویستانەو گەرمەو هەرگیز کەم ناکات. ئەوان هەردەم رەفتاریان بە دلسۆزیەکی بێ هاوتاوە دەکردو، کاتیکیش پەلاماردانیك بۆ سەر شارەکە نزیك دەبۆوە، چەندیك زۆر خانوەکانیان جێی بوایەتەوە، ئەوەندە دالدەی هاوسێ ئیرانیەکانیان ئەدا. ئەمەش بۆ ئەوە دەکرا، بۆ ئەوەی ئەو بۆچونە نادروستە نەهیلن کە ئەوان تەنها بەپەرۆش بون بۆ رزگارکردنی مەسیحیەکان.

لەبەر ئەوە مۆنسینور کلوزل ی گەورە قەشەی فەرەنسی، پەنای بۆ من هینابو کە خۆیو ئەندامەکانی ارسالیەی لازاری بپاریزم، لەبری ئەوان (لاجل) پەیامیکم بۆ شیخ ناردو، خوشکانی خیرخواز (Charity) لەلایەن ژنە ئەمریکاییەکانەوە داوەت کران کە لەگەلیاندا لە کۆلیجەکە نیشتەجێ بن تا مەترسیەکە کۆتایی دیت، بەلأم داوەتەکەیان قوبولّ نەکرد. بەیداخی Union Jack شان بەشانی بەیداخی ئەستیرەو خەتەکان (دیارە مەبەستی بەیداخی ئەمریکایە، وەرگیر) بەسەر بیناکانی کۆلیجەکەوە دەشەکانەوەو، نوسینیکی فارسیش لەسەر قاپیەکان هەلکەندرابو:

نشینگەی کۆنسۆلی ئینگلستانو میسیونیرە ئەمرکاییەکان.

سەرو ٣٠٠ نەستۆریو ژمارەیەکی زۆر لە ئیرانی پەنایان بردبوە بەر دەورو بەرو حەوشەی کۆلیجە ئەمریکاییەکە. خانوی ارسالیەکە لەناو شاردا بەریز قەشە مستەر ویپل ی تیادا بو بە مەترسیەکی زۆرەوە لەسەر ژیانی.

من ئەمە بەهەل دەزانم تا بەرەسمی رونی بکەمەوە کە ئەو راپۆرتانەی دەربارەی زەرەرو ئازاردانی میسیونیرە ئەمریکاییەکان بلأو کراونەتەوە، افتراو ناوشیواندنو زیانبەخشنو، بە تەواویش لەراستیەوە دورن. هۆ زۆرە بۆ ئەوەی ویلایەتە یەککگرتوەکان شانازی بەو پیاوانەوە بکات کە هەمیشە جوامیرو لەبەرچاون بۆ ئەو ئەرکو فرمانە ئاییینیانەیان کە لە ورمێ، لەناو قاتوقری، تاعونو، جەنگدا عەزم ئازایەتیەکیان ئەنواند، کە هەرگیز لەبیر ئەو کەسانە ناچیتەوە کە لەو فەسلی مەینەتیانەدا لەوێ ئامادە بون.

سەبارەت بە سکالأو گازەندەکردن لەکاربەدەستەکانی ئازەربایجان، من لەبری میسیۆنیرەکان ئەو راستیانەی پیشەوەم خستۆتە بەرچاویانو، گوتوشمە کە هەر تەنگ پیهەلچنینیك کە بەو پیاوانە یا خیزانەکانیان بکریت، وا حکومەتی خاوەن شکۆ بەنارەزاییەکی زۆرەوە تێی ئەروانێ.

## هاوپێچی ٢ی ژمارە: ٨٥

**لە ئابۆتی کۆنسۆلی گشتیەوە بۆ مستەر تۆمسن**

بەریز، تەوریز، ٢٩ی ك١، ١٨٨٠.

ئیمرۆ، شەرەفی ئەوەم هەبو کە ئەم بروسکەیەی لای خوارەوەتان بۆ رەوانە بکەم:

نامەیەکی میسیۆنیرە ئەمریکاییەکان بە بەرواری ٢٣ی ئەم مانگە، پیم رادەگەیەنیت کە سوپاسالار زۆر بە لوتفەوە پیشوازی لیکردونو، دلنیای کردون لەویستو ئامادەیی بۆ پاراستنیان، وە حکومەتی ئیرانیش هیچ باوەری نەکردوە بەو سومعە شیواندنو لەکەدارکردنەی دژیان بلاوکراوەتەوە."

وا هاوپیچ هەلبژاردەیەکی ئەو نامەیەی لای سەرەوە ئاماژەی بۆ کراوە، دەنیرم

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپیچی ٣ی ژمارە: ٨٥.

**لە قەشە (کاهن) ب. لاباری وە بۆ کۆنسۆلی گشتی، ئابۆت**

(هەلبژاردە) ورمێ، ٢٣ی ك١، ١٨٨١.

رۆژیك دوای گەیشتنی سوپاسالار بۆ ئیرە، سەردانمان کردو، بە لوتفیکی زۆرەوە پیشوازیمان لیکرا.

ئیمرۆ، سەردانی سوپاسالارمان کرد. تەئکیدی بۆ کردین کە حکومەت باوەری بەم سومعە شکاندنو لەکەدارکردنەی دژی ئیمە کراوە، نەکردوەو، تەقدیرو پیزانینی خۆی دەربری بۆ ریکخراوە (دەزگا) خیرخوازە گەورە، بەبەهاو، بەخشندە بێ لایەنەکەمان. ئەو (سوپاسالار) دەیگوت، کە ئیمرۆ لە تارانەوە پێی گەیشتوە کە لەسەر داوای حکومەتی ئەمریکا، ئیرل گرانڤیل بروسکەی بۆ مستەر تۆمسن کردوە بۆ ئەوەی لە شا داوابکات مسیۆنیرە ئەمریکاییەکان لە رقو دوشمنایەتی ئیرانیەکان لە ورمێ بپاریزیت. ویستو نیەتی چاکی دەربری بۆ جیبەجیکردنی ئەوکارە.

## ژمارە: ٨٦

**لە کۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە ٤ی شوباطی ١٨٨١دا وەرگیراوە)**

گەورەم، تەوریز، ٣١ ك١، ١٨٨١.

ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە کە هەلبژاردەی ئەو نامە نوێیانەی (پیکهاتون لە شەش هاوپیچ) کە ئاراستەی وەزیری مفوض حکومەتی خاوەن شکۆم کردون لە تاران، دەربارەی بەرژەوەندی سیاسی بۆ جەنابتان بنیرم.

(ئیمزا) ولیام جی. ئابۆت

## هاوپیچی ١ی ژماره: ٨٦

**له كۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وه بۆ مستەر تۆمسن**

**بەریز،** **تەوریز، ٩ی ك١، ١٨٨٠.**

**وا دەردەكەویت كە كاری (مهمه) هیور كردنەوەی لەسەر سنوری كوردستان بەرینمایی سوپاسالار بەباشی بەرەو پیشەوە دەچیت؛ ژمارەیەكی زۆر لەدیل، كە كوردەكان لەمیاندواوو شوینی تر گرتویانن، تەسلیم بەپایەبەرزی كراون؛ وە ئیرانیش داوای بژاردنی ئەو زەرەرو زیانەی جەنگیان لە سەرۆكە كوردەكان كردوە، كە ژمارەیەكی زۆریان ئیستا وەلایان كردۆتەوە بۆ شا.**

**زانیاریەكی ئەوتۆ دەربارەی هەمزاغای سەرخیلی مەنگور نیە، وەنە دەربارەی ئەو لەشكركیشیەش هەیە (واباسدەكریت، لەچوار فەوجو هەندێ سوارەی غەیرە نیزامی پیكهاتوە بە فەرماندەیی جەنەراڵ حەسەن عەلی خان ی ئەفشار) كە وەك من تیی گەیشتوم. كراوەتە سەری.**

**هەوالی ئەوە هەیە كە سوپاسالار بەم زوانە بۆ ورمێ دەچیتە پیش. لەو راپۆرتە هاوپیچەی یەكیك لە میسیۆنیرەكان بۆ منیان ناردوە، دەردەكەویت كە سوننی، شیعەو، مەسیحیەكان لەو ناوچەیەدا زۆریان چیشتوە. بیگومان، سوپاسالار لەم مەسەلانە دەپرسیتەوەو بەو شیوەیەی پیویست بیت ریو شوینی بۆ دادەنیت.**

## هاوپیچی ٢ی ژماره: ٨٦

**هەلبژاردەی نامەیەك كە ئاراستەی كۆنسۆلی گشتی، ئابۆت كراوە**

**ورمێ، ٣٠ ت٢، ١٨٨١.**

**پیاوەكانی تەیمور پاشا ئەوەندەی كوردەكان خراپ بون لەسەرجەم تالآنیو كارە نارەواو خراپەكاریەكانیاندا. سوننیەكان دەلین، لە ورمێ ٥٠٠٠ بنەمالەن– چەند گوندیكی كەمیان نەبیت كە مەزەبیان گۆریوە بۆ شیعە، بەتەواوی لیكترازان. كەوتونەتە دۆڵو گوندە بچوكەكانی ناو چیاكانەوەو، ئەوەندە نەبوەن، خەریكە لەبرساو لەسەرمادا دەمرن. ژمارەیەكی زۆر لە پیاوەكان كوژراون.**

**سەبارەت بە مەسیحیەكان، ئەو ئامارانەی تا ئیستا لەبەر دەستماندایە ئەوە دەردەخات كە ٢٧ گوند تالآنكراوە، زۆربەیان لەلایەن كوردەكانی شكاكو، رەعیەتە سونییەكانی ئیرانەوە؛ هەندیكیشیان لەلایەن پیاوەكانی تەیمور پاشاو شیعەكانەوە.**

**خراپترین حالەت گاڤیلان ٥: ٢٧ بنەمالە، چیان هەبوە تالآن كراونو ٦ پیاویشیان كوژراوە.**

ئـەوی تـر چارباشـە: زیــاد لــە ١٠٠ خــیزان تــالآنكراونو ٤ كەســیان كــوژراوە. بەگشتی، نزیكەی ٤٠٠ بنەماڵە، بەهۆی ئەوەی كە تالآنكراون لە وەزعیكی زۆر نـەبو و هەژاریدان.

## هاوپیچی ٣ی ژمارە: ٨٦

### لە كۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وە بۆ مستەر تۆمسن

(هەلبژاردە) تەوریز، ١٥ ك١، ١٨٨١.

وەلیعەهد لە سوپاسالارەوە هەواڵی پێگەیشتوە، كە بەهیوایە لە ١٢ی ئەم مانگەدا بگاتە ورمێ.

بەپێی قسـەی كـاتبی فەوجیك، ئـەو لەشكركیشـیەی (حملـە) كرابـوە سـەر خیلـی مەنگور، پاش ئەوەی گوندەكانی هەمزاغایان ویران كرد، گەرانەوە بارگەكەیان. هەمان ئەوكەسـە رایگـەیاند كـە ژمارەیـەكی زۆر لـە مەنگوریـەكان كـوژراون، هـی تریـان بـەدیل گیراون؛ هەزار حوشـترو تالآنیـەكی زۆر بەشـی زۆری لەلایـەن خیلـەكانی لای مەراغـەو حوشترو دەوە بەتالآن بران– لەلایەن هیزەكانی ئیرانەوە گیراونەتەوە، ئەو هیزانەی كە مالـەكـەی هـەمزاغایان سـوتاندو ١٦ كـەس لەدانیشـتوەكانی بـەژنو منالـەوە بەكۆمـەڵ كوژران. واباسدەكریت، هەمزاغاو ژنەكەی توانیویانە دەربازبن.

بیگومان، ئەو هەواڵەی پیشەوە پیویستی بە تەئكید لی كردن هەیە.

## هاوپیچی ٤ی ژمارە: ٨٦

### لە كۆنسۆلی گشتی، ئابۆت وە بۆ مستەر تۆمسن

(هەلبژاردە) تەوریز، ١٦ ك١، ١٨٨٠.

لیرە هەواڵی ئەوە هەیە، بەلآم پیویستی بە تەئكید لی كردنیشە، كە بەهۆی ئەوەی هیزەكانی تورك ریگەیان لە هەمزاغا گرتوە لە سنور بپەریتەوە، ئیستا شـوینەكەی لـە نزیكـەوە لەلایـەن ئیرانیەكانـەوە گـەمارۆ دراوە، وە شـیخ عوبەیدوالـلـەش لــە خــاكی توركیـادا گیراوە، بەلآم داوا دەكـات ریگـە بدرێ لەبــەر دەم مەجلیسـیكدا بـەرگری لـە قەضیەكەی بكـات. ئەمـە گـەر راسـت بیـت، مانـای ئەوەیـە كـە لەبـەردەم نوینـەرانی توركیاو ئیراندا بیت.

## هاوپیچی ٥ی ژماره: ٨٦

**لە کۆنسوٚلی گشتی، ئابۆت وە بۆ مستەر تۆمسن**

**(هەلبژاردە) تەوریز، ٢٩ ك١، ١٨٨٠.**

**هەمزاغاو لایەنگرەکانی هەولیان داوە لە سنور بپەرنەوە بۆ ناو تورکیا، بەلاّم روبەروی باندیکی گەورە لە کوردە دوشمنکارەکانی تورکیا بونەتەوە. شەریکی خویناوی رویداوە. مەنگورو سەرۆکەکەیان بۆ ناو خاکی ئیران هەلبراونەتەوە دواوەو، بۆ سەردەشت هەلاّتون.**

**نامەیەك لە دو قازی سابلاّخ وە گەیشتۆتە ئیرە، هەوالی ئەوەی گەیاندوە کە هەمزاغا بە هیزیکی گەورەوە گەمارۆی سەردەشتی داوە.**

**کاتیك وەزیر فاڤایت بەمە دەزانیت، کات بەفیرۆ نادات‌و فەوجیك لە هیزی نیزامی، هەندیّ میلیشیاو، دو تۆپ لە سابلاّخ وە دەنیریت بۆ سەردەشت. هەروەها ئەو هەنگاوانەی کە نابوی بۆ بەرەنگاربونەوەی جموجولەکانی هەمزاغا، بە وەلیعەهدی راگەیاندو، لە ئەنجامی ئەمەشدا وای بەباش زانی (وەلیعەهد) کە بۆ حالی حازر سوارەی شاە سەڤەند، کە بەو دواییانە لە جەنگ گەرابونەوەو بەریگاوە بون بۆ تاران، لە تەوریز بهیلرینەوە.**

## هاوپیچی ٦ی ژماره: ٨٦

**لە کۆنسوٚلی گشی، ئابۆت وە بۆ مستەر تۆمسن**

**(هەلبژاردە) تەوریز، ٣٠ك ١، ١٨٨٠.**

**بەپیی ئەو هەوالەی گەیشتۆتە ئیرەو، پیویستی بە تەئکید کردنە، ئەو لەشکرانەی روسیا کە لە نەخچەوان خۆیان سازدابو (بارگەیان لیدابو)، لە ٢٤ی ئەم مانگەدا دەستیان کرد بە گەراندنەوە بۆ مەرکەزەکەی خۆیان.**

## ژماره: ٨٧

**لە مستەر. St جۆن وە بۆ ئیرل گرانڤیل– (لە کاتژمیری ٣,٤٥ پاش نیوەرۆی ٤ی شوباط دا گەیشتوە)**

**(بەبروسکە) ئەستەمولّ، کات ژمیری ١,٤٥ پاش نیوەرۆی ٤ی شوباطی، ١٨٨١.**

**بروسکەیەکم لە کاپتن کلایتن وە پیگەیشتوە، رایدەگەیەنیت کە شیخ عوبەیدوللە خۆی ئامادە دەکات بۆ هوروژمی نویّ بۆ ناو ئیران، وە لەلایەن سولتانەوە یاریدەدەریکی کامپی** (Aide- de- Camp) **بۆ نیردراوە.**

سەفیری ئیران لیرە، لەوە دەپرسێ گەر من دەسەڵاتم درابیتێ پشتگیری لە نارەزاییەکانی بکەم لای بابی عالی.

## ژمارە: ٨٨

لە ئیرل گرانڤیل وە بۆ مستەر تۆمسن

بەریز، وەزارەتی دەرەوە، ٥ی شوباط، ١٨٨١.

بروسکەکەی ٤ی ئەم مانگەتانم وەرگرت کە دەلین زانیاریتان پیگەیشتوە کە شیخ عوبەیدوالله خەریکی خۆسازدانە بۆ هوروژمیکی نوێ بۆ ناو ئیرانو، سەفیری ئیرانیش پرسی ئەوەی کردوە گەر ئیوە تەخویل کرابن بۆ پشتگیری کردنی گازندەکانی لای بابی عالی.

بەوە دەزانم کە سەفیری روسیا رینمایی کراوە کە پشتگیری لەو جۆرە نارەزاییانە بکاتو، منیش هاوشان لەگەڵ مسیۆ دی ناڤیکوڤدا، پیویستە ئامۆژگاری تۆ بکەم کە پشتگیری لەو گازندانە بکەیت کە حکومەتی ئیرانی بەرامبەر بە بەزاندنی سنورەکەیان لەلایەن باندە کوردەکانەوە، دەیکات.

(ئیمزا) گرانڤیل

## ژمارە: ٨٩

لە مستەر Stجۆن وە بۆ ئیرل گرانڤیل- (لە ١٧ی شوباتدا وەرگیراوە)

گەورەم، ئەستەموڵ، ٧ی شوبات، ١٨٨١.

ئامارژە بە بروسکەکەی ٥ی ئەم مانگەی جەنابتان، ئەز شەرەفی ئەوەم هەیە رایبگەیەنم کە ئیمرۆ، دەربارەی مەسەلەی بونی بەردەوامی  شیخ عوبەیدوالله لەنزیك سنوری ئیرانەوە، قسەم لەگەڵ وەزیری کاروباری دەرەوەدا کرد. گوتم، حکومەتی خاوەن شکۆ ئیستا ئامۆژگاری کردم تا ئەو گازندانەی کە سەفیری حکومەتی خاوەن شکۆ دو مانگ لەمەوبەر کردبونی، بۆ بەریزی دوپات بکەمەوە، وە هەروەها گوتی، بەپیی ئەو زانیاریانەی پیی گەیشتوە، ئەم شیخە ئاژاوەچیە (بەئاشوبە) جاریکی تریش خەریکی خۆسازدان بوە بۆ هوروژمیکی تر بۆ ناو ئیران.

عاسم پاشا وەڵامی دایەوە کە من خراپ تیگەیەندراومو، ئیجرائات کراوە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکە بەشیوازیکی قەناعەت پیکەر، وە ئەو خراپەو مەترسیانەی سەفیری ئیران لە راپۆرتەکانیدا داویەتی بە حکومەتەکەی، زۆری پیوە نراوە.

عاسم پاشا لەسەری رۆیشتو گوتی، واتەواتی چەکدارکردنی کوردەکان بێ بنچینە بوە، ئەو جۆرە ریو شوینە هەرگیز لەلایەن حکومەتی تورکیاوە تەنانەت بیریشی لینەکراوەتەوە، باشترین هۆش ئەوەیە کە ئەوان (کوردەکان) رەگەزیکی سەرشیتو ئاشوبە چین، کە زۆر زەحمەتە کۆنترۆڵ بکرین گەر چەکیان بدریتێو فیری بەکارهینانیان بکرین.

بەکورتی، بەریزی وای لیکردم بگەمە ئەو دەرئەنجامەی کە، هەرچەندە لەنیو کوردەکاندا کەسانی ئەوتۆ هەن کە لەوانەیە چەکیان لەدەرەوەی وڵات بۆ بەکارهینانی خودی خۆیان کریبیت، بەڵام بیگومان حکومەت بایەخ بە ریگەگرتن لەو جۆرە مارەسەیە دەدات وەك لەوەی هانی بدات. لەبەر ئەم هۆیە بو کە کوردەکان لەماوەی دوا جەنگ لەگەڵ روسیادا، چەکیان نەدرایە.

(ئیمزا) ف. ر. St جۆن

| ژ | ناو | بەروار | بابەت | لاپەرە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مستەر تۆمسۆن | ١٤ مایس ١٨٨٠ | رااوروتی کورد لەسەر سنوری تورکیا ئیران، ئارەزوی ئیران بۆ گەڵالەکردنی ریکەتننامەیەك لەگەڵ بابی عالیدا لەو بارەیەوە | ١ |
| ٢ | بۆ مستەر گۆشین | ١ تەمموز | بابی عالی هان بدریت کات بەفیرۆ نەدات لە رەوانەکردنی رەشنووسی ریکەوتننانە بۆتاران (سەیری ژ. ١بکە) | ١ |
| ٣ | بۆ مستەر تۆمسۆن | ١ تەمموز | زمانیکی پەسندکردن لەلایەن ئەوەوە بەکاردەهینریت وەك لەژمارە (١)دا راگەیەندراوەو ئەو ئاگادار دەکات لەرەوانەکردنی بۆ مستەر گۆشین (سەیری ژ. ٢ بکە) | ١ |
| ٤ | مستەر گۆشین | ٣ ئاب | کۆپی‌یەکی داخراوی پەیامیك ئاراستەی بابی عالی کردووە سەبارەت بەو راووروتەی لەلایەن کوردەکانەوە کراوە. | ٢ |
| ٥ | بۆ مستەر گۆشین | ١٩ ئاب | پەسندکردنی مەرجەکانی پەیامەکەی ئاراستەی بابی عالی کراوە کەلە ژ. ٤دا بەنهینی هاوپیچ کراوە | ٤ |
| ٦ | مستەر گۆشین | ١٧ ئاب | ناردنی پەیوەندی‌یەکی پاتریارکی ئەرمەنستان سەبارەت بە پیکهینانی کۆمەلەیەکی کوردی | ٥ |
| ٧ | مستەر گۆشین | ٢٣ ئاب | ناردنی کۆپی بەرقی‌یەیەکی کلایتۆنی جیگری کۆنسوڵ سەبارەت بەریوشوینەکانی شیخ عوبەیدوڵای کوردەوەو هەلویستی مەسیحی‌یە نەستۆرانی‌یەکان | ٧ |
| ٨ | کۆنسوڵ ژەنەرال ئابۆت | ٣١ تەمموز | ناردنی کۆپی سێ بروسکە بۆ وەزیری خاوەن شکۆ لەتاران سەبارەت بە ئالۆزی‌و گرژی لەسەر سنوری تورکیاو ئیران‌و ئیمپراتانەکانی شیخ عوبەیدولا | ٨ |
| ٩ | مستەر تۆمسۆن | ٢٤ ئاب | بەردەوام دەبیت لەهاندانی حکومەتی ئیران بۆ ئەوەی هاریکاری بکات لەپاراستنی نیزام لەسەر سنور وەزعی دانوستاندن سەبارەت بە رەشنوسی پیشنیارکراوی ریکەوتننامە | ١٠ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٠ | مستەر تۆمسۆن | ٨ تشرینی یەکەم | دەستەی گەورەی کورد شارۆچکەو ناوچەی سووج- بۆلاك یان گرتووە. دەسەلاتدارانی ئیرانی رایان کردوە. ئەو هەنگاوانەی لەو بارەیەوە لەلایەن حکومەتەوە گیراونەتەبەر | ١١ |
| ١١ | مستەر تۆمسۆن | ١١ تشرینی یەکەم | رەوانەکردنی دیداریك لەگەڵ شادا سەبارەت بە یاخیبوونی کورد لە ئازەربایجان. ئەو تکا لە حکومەتی خاوەن شکۆ دەکا لای ئەستانبوڵ تەدەخول بکات. | ١١ |
| ١٢ | ئەسیم پاشا بۆ موسورو س بیگ (بروسکە) | ١٤ تشرینی یەکەم | بابی عالی بیستویەتی کە کوری شیخ عوبەیدولا بەسەرۆکایەتی باندیك بۆ مەبەستی راوروت خەریکە بپەریتەوە بۆ ناوچەکانی تورکیا | ١٢ |
| ١٣ | بۆ مستەر تۆمسۆن | ١٦ تشرینی یەکەم | تەئکیدکردنی ژ. ١٢ | ١٣ |
| ١٤ | مستەر گۆشین | ١٢ تشرینی یەکەم | زانیاری لەلایەن مستەر تۆمسنەوە دراوە (سەیری ژ. ١٠ بکە) بە بروسکەش لە بەغداو وانەوە سەلمینراوە. وتوویژ لەگەڵ بالیۆزی ئیران سەبارەت بە ریکەوتننامەیەك لەنیوان ئیرانو تورکیادا. | ١٣ |
| ١٥ | بۆمستەر گۆشین | ١٩ تشرینی یەکەم | ناردنی کۆپی ژ ٩٠ بۆ هاندانی بابی عالی بۆ خیراکردن لە گەلالەکردنی ریکەوتننامەیەك لەگەڵ ئیراندا. | ١٣ |
| ١٦ | مستەر گۆشین | ١٩ تشرینی یەکەم | ناردنی کۆپی بروسکەیەك لەلایەن بالیۆزی ئیرانەوە نیردراوە سەبارەت بە داگیرکاری کوردان | ١٤ |
| ١٧ | مستەر تۆمسۆن | ٢٧ تشرینی یەکەم | تەئکیدکردنی نامەیەك لە مستەر ئابۆتی حەوتەمینی خیراوە. ورمێ لەژیر هەرەشەی کوردان دایە. بەگویرەی راپۆرت مستەر ئابۆت ئەوێی جێ هیشتووە. | ١٤ |
| ١٨ | مستەر تۆمسۆن | ٢٨ تشرینی یەکەم | بە گویرەی راپۆرت یەکیك لە کورەکانی شیخ عوبەیدولا کوژراوە لە شەریکدا لەنزیك مەراغە. پیشکەوتنی هیزەکانی ئیران | ١٥ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٩ | مستەر گۆشین (بروسکە) | ٢٩ تشرینی یەکەم | هەواڵ دەدا کە حاکمی سورونیا رایکردووە، شیخ عوبەیدولا لەسنور پەرپوەتەوە بۆ ناو ئیران | ١٥ |
| ٢٠ | مستەر تۆمسۆن | ٣٠ تشرینی یەکەم | زانیاری کە لە ژ. ١٢دا دراوە. پیچەوانەیە لەگەڵ دیدو لیدوانەکانی شیخ عوبەیدولادا. سەرۆکە کوردەکان ئارەزوو دەکەن کوردستانیکی سەربەخۆ دابمەزرینن. | ١٦ |
| ٢١ | مستەر تۆمسۆن | ١ نۆڤەمبەر | کوردان لەورمێ کشاونەتەوە | ١٦ |
| ٢٢ | مستەر گۆشین | ٢٤ ئۆکتۆبەر | کۆپی بروسکەیەکی مەیجەر ترۆتەر سەبارەت بە پروپاگەندەی هەولی پیکهینانی کۆمەلەیەکی کوردی | ١٦ |
| ٢٣ | مستەر تۆمسن (بەبروسکە) | ٢ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | شا زۆری پیخۆشە کە رونکردنەوەیەکی زیاتر بکریت بۆ بابی عالی، وە جەختیان لەسەر بکەن کە سنورەکە بەباش چاوەدیر بکەن. | ١٧ |
| ٢٤ | بۆ مستەر گۆشن | ٢ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | ئەو پیشنیارەی پیباشە کە یەکیك لە کۆنسوڵەکانی خاوەن شکۆ لەگەڵ کۆمسیۆنەکەدا بیت ٠بروانە ژ: ١٤).. | ١٨ |
| ٢٥ | مستەر پلەنکیت (بەرووسکە) | ٤ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | حکومەتی روسیا هیزی ئامادە کردوە بۆ یارمەتیدانی ئیرانیەکان بۆ مل پیکەچکردنی کوردە تالانکەرەکان. | ١٨ |
| ٢٦ | بۆ مستەر پلەنکیت | ٦ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | پرسیار لە حکومەتی روسیا دەکات کە ئەگەر بەراستی ئاگادار کرابیت. (بروانە ژ: ٢٥) | ١٨ |
| ٢٧ | مستەر گۆشن (بەبروسکە) | ٧ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | ئەو هەنگاوانەی کە بابی عالی ناویتی بۆ ریگەگرتن لە هۆزە کوردە گەرۆکەکان لە چونەوەیاندا بۆ ناو ناوچە تورکیەکان.. | ١٨ |
| ٢٨ | مستەر پلەنکیت | ٨ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | برگەیەك لە "بیریگ Bereg" ئەوە پیشان ئەدات کە شا بو داوای یارمەتی روسیای کردبو (بروانە ژ: ٢٦) | ١٨ |
| ٢٩ | مستەر پلەنکیت | ٣ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | گفتوگۆ لەگەڵ بارون (نبیل) جۆمینیدا سەبارەت بە ئاشوبەی کوردەکانەوە. لەوانەیە روسیا بەشیوەیەکی راستەوخۆ تر گرنگی پێ بدا .. | ١٩ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٣٠ | مستەر تۆمسن (بە بروسکە) | ٨ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | ئیرانیەکان هیشتا ئورمیەیان بەدەستەوەیە، بەڵام کوردەکان نەکشاونەتەوە وەك باسکرابو.. | ٢٠ |
| ٣١ | مستەر تۆمسن (بە بروسکە) | ٨ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | لەم کاتەدا، حکومەتی ئیران بەهیوای ئەوەیە کە بتوانێ یەکیتی (یەکبون) کوردەکان بە وتوویژ تیك بشکینی. | ٢٠ |
| ٣٢ | مستەر پلەنکیت | ٨ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | بارون جۆمینی رونی دەکاتەوە کە شا بوە حەزی خۆی دەربریوە بۆ یارمەتی روسیا، وە رازیش بوە ٠بروانە ژ: ٢٦) | ٢٠ |
| ٣٣ | مستەر گۆشن | ١ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | لەسەر ژمارە ١٥ کاری کردوە | ٢١ |
| ٣٤ | مستەر تۆمسن | ٩ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | پاریزگاری ئوورمیە راپۆرتی داوە کە توانیویتی کوردەکان لە خەندەقەکانیان (سەنگەرەکانیان) بەدەرنێ. | ٢١ |
| ٣٥ | بۆ مستەر پلەنکیت | ٩ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | گفتوگۆ لەگەڵ بالیۆزی روسیادا سەبارەت بە داوای شا کە هیزەکانی روسیا یارمەتی بدەن بۆ شکاندنی کوردەکان | ٢١ |
| ٣٦ | مستەر تۆمسن | ١٢ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | سوپاسی شا بۆ ئوفیسە چاکەکانی ئینگلتەرە کە قەناعەتیان بەبابی عالی کردوە بۆ هاوکاریکردن لە دامرکاندنی یاخیبونی کوردەکاندا. | ٢٢ |
| ژ | ناو | بەروار | بابەت | لاپەرە |
| ٣٧ | مستەر تۆمسن (بە بروسکە) | ١٢ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | راپۆرتی کوشتنی فەرماندەی هیزە قایم کراوەکان کە لە تارانەوە نیردراوە. بەهاناچونی سابلاخەوە لەلایەن ئیرانیەکانەوە | ٢٢ |
| ٣٨ | مستەر گۆشن (بەبروسکە) | ١٣ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | ئایا هانی بابی عالی بدات بۆ گرتنی شیخ عوبەیدولاو کورەکانیو سزاشیان بدات بەشیوەیەك کە ببنە عیبرەت؟ | ٢٢ |
| ٣٩ | بۆ مستەر گۆشن | ١٣ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | رونکردنەوە بۆ بابی عالی سەبارەت بە شیخ عوبەیدولا بۆ لیهاتویی (فطنە) خۆی بەجێ دەهیلری.. دەبێ بابی عالی ئاگادار بکریت کە پەناهەندەیی نەداتێ. | ٢٢ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٤٠ | مســـــتەر گۆشن | ٩ نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | نـاردنی دوو بروسـکە لەلایــەن جیگـیری کۆنسوڵ (کلایتـۆن) سـەبارەت بەکیشــەی کوردەوە | |
| ٤١ | بۆ مسـتەر پلەنکیت | ١٦ نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | جــەخت کردنــی م. دێ گــیرز لەریگـــەی بـالیۆزی روسـیاوە کە ئیمـپراتۆر سـوورە لەســەر ئــەوەی کــە ریگــە بگریــت لــە هیزەکـانی، ئەوەندەی کە لە توانـادا بـێ، کە سنور نەبەزینن | ٢٤ |
| ٤٢ | مســـــتەر تۆمسن | ١٩ نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | کۆنسولی گشتی حکومەتی خاوەن شکۆ لــە تــەوریز راپۆرتــی داوە کـــە هـــەمو هیزەکانی کوردەکان خەریکی هەڵاتنن. | |
| ٤٣ | مســـــتەر تۆمسن | ٢٠ نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | کۆنسـولی گشـتی حکومـەتی خـاوە شــکۆ لـــــە تـــــەوریز راپۆرتـــــی گەیشـــــتنی قوزاقـەکانیان داوە لـە نەخچـەوان، نزیـك بەسنوری روسیا. | ٢٥ |
| ٤٤ | مســـــتەر پلەنکیت | ١٧نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | بـارون جۆمینـی دەلیـت راپۆرتـەکانی ئـەو دواییانــەی کوردســـتان زۆرتــر شـــوینی رەزامەندین | ٢٥ |
| ٤٥ | مســـــتەر گۆشن | ١٦ نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | گفتوگۆ لەگەڵ وەزیرانی تورکدا دەربارەی هەلسـانی کوردەکـان. بۆچونـی تورکـەکان سەبارەت بە مەسەلەکە | ٢٦ |
| ٤٦ | مســـــتەر تۆمسن | ٢٣ نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | گفتوگـــۆ لەگـــەڵ شـــادا ســـەبارەت بـــە یاخیبونـە کوردیەکـەوە خـاوەن شـکۆ وای بـۆ دەچــێ کــە بــابی عــالی بەرپرســیارە لەهـــەمو ئـــەو شـــتانەی رویـــانداوە. بۆچونەکـانی سـەبارەت بـەو هەنگاوانـەی کــە دەبیــت بــنرین بــۆ ســزادانی شــیخ عوبەیدوڵا. | ٢٧ |
| ٤٧ | مســـــتەر تۆمسن | ٢٤ نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | زانیـــاری ســـەبارەت بـــە جموجولـــی هیزەکانی روسیا لەسەر سنوری ئیران | ٢٨ |
| ٤٨ | بۆ مسـتەر گۆشین | ٢٤ نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | لەوانەیـە ئامۆژگارییـەکی وای بـابی عـالی بکــات وەك پــێی وایــە پیویســتە بـــە گەرانەوە بۆ ژ. ٤٦. | |
| ٤٩ | مســـــتەر پلەنکیت | ٢٤ نۆڤەمبـــەر ١٨٨٠ | بـــارۆن جۆمینـــی رادەگەیـــەنیت دوا بەدواداچوونـــەکانی لـــە کوردســـتانەوە بەتــەواوی قایلکــەر نــین بۆچوونــەکانی ســەبارەت بــە ئامادەکــاری ســەربازیی روسیا | ٢٩ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٥٠ | مستەر تۆمسۆن | ٢٥ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | کۆنسۆلی گشتی خاوەن شکۆ لە تەبریز هەوالی گەیشتنی ٢٠٠ قەفقاسی روسیایی بۆ نەخچەوان رادەگەیەنیت | ٢٩ |
| ٥١ | مستەر گۆشین (بەبروسک ٥) | ٢٥ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | وەزیری کاروباری دەرەوە رایدەگەیەنیت کۆمیسیۆنیك پیك دەهینریت بۆ ئەوەی شیخ، کورەکەی‌و یاخی‌بووەکانی دیکە دادگایی بکاتو لە کاروبارەکان بکۆلیتەوە. | ٣٠ |
| ٥٢ | مستەر تۆمسۆن | ٢٨ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | بەگویرەی راپۆرت زۆر لەسەرۆکە کوردەکان مل کەچی خۆیان بۆ حکومەتی ئیران راگەیاندووە و خۆیان بە دەستەوە داوە | ٣٠ |
| ٥٣ | مستەر پلەنکیت | ٢٩ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | بارۆن جۆمینی بیستویەتی کە شیخ عوبەیدولا پلانەکانی دەست پیکردۆتەوەو شانکا لە حکومەتی بەریتانیاو روسیا دەکات بابی عالی هان بدەن بۆ ئەوەی تاوانبار سزا بدات. | ٣٠ |
| ٥٤ | مستەر گۆشین | ٢٦ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | ناردنی چەند بروسکەیەکی کلایتۆن جیگری کۆنسوڵ سەبارەت بە داگیرکاری کوردو جموجولەکانی سوپاکە دەستی پیکردووە. | ٣١ |
| ٥٥ | کۆنسۆلی گشتی ئابۆت | ١١ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | راپۆرتیك دەدات سەبارەت بە رەوشی مەسیحی‌یە نەستۆرانی‌یەکانی ورمیّ | ٣٤ |
| ٥٦ | کۆنسۆلی گشتی ئابۆت | ١٥ نۆڤەمبەر ١٨٨٠ | رەوانەکردنی چەند برگەیەکی بیرەوەری رۆژانی مانەوەی لەورمیّ لەکاتی داگیرکاری کورداو ناردنی کۆپی بروسکەیەك بۆ مستەر تۆمسۆن لەو بارەیەوە | ٣٧ |
| ٥٧ | مستەر تۆمسۆن | ٧ دیسەمبەر | حکومەتی ئیرانی زانیویەتی کە شیخ عوبەیدولاو کورەکانی ئیستا بەدریژایی سنوری ئیران کشاونەتەوە. | ٤١ |
| ٥٨ | مستەر تۆمسۆن | ٩ دیسەمبەر | سیمای باشی گیرانەوەی نیزام لە سنوری کوردا | ٤١ |
| ٥٩ | مستەر تۆمسۆن | ١٧ ئۆکتۆبەر | فەرماندەی تورك رایدەگەیەنیت ئەو ریرەوانەی داگیرکردوە کە لێیانەوە کورد دەیەرینەوە ناوچەکانی تورکیا. | ٤١ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦٠ | مستەر تۆمسۆن | ٢٩ ئۆکتۆبەر | ناردنی کۆپی بەیانیکی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئیران بۆ نوینەرانی بیانی لەتاران سەبارەت بە یاخی بوونی کورد، لەگەڵ هەندیك نامەی دیکەدا. | ٤٢ |
| ٦١ | مستەر تۆمسۆن | ٣١ ئۆکتۆبەر | پیشکەشکردنی بروسکەیەك لە مستەر ئابۆتەوە کە زانیاری سەبارەت بەیاخیبوونی کوردو چەند کۆپییەکی چەند نامەیەك کە لەلایەن شیخ عوبەیدوڵاوە نووسراون بۆ دەربرینی دیدو ئامانجەکانی. | ٢٤ |
| ٦٢ | مستەر گۆشین | ٢٩ نۆڤەمبەر | گفتۆگۆیەك لەگەڵ ئەیسم پاشا سەبارەت بەرووداوەکانی کوردستان. ئەو سکاڵا لەدەست حکومەتی ئیرانی دەکاتو دەلیت بابی عالی ریرەویکی بەدوادا چوون لەگەڵ ئیراندا لەو بارەیەوە پیك دەهینیت. | ٥٠ |
| ٦٣ | بۆ مستەر تۆمسۆن | ٩ دیسەمبەر | مژدەبەرانی ئەمریکی لە ورمێ بۆ ئەوەی ئۆمنیە چاکەکانی لە جیاتی بەکاری بهینیت. | ٥١ |
| ٦٤ | مستەر تۆمسۆن | ١٠ دیسەمبەر | نارەحەتی بەرامبەر مژدەبەرانی ئەمریکایی رۆلی خۆی بینیوە (سەیری ژ. ٦٣ بکە). | ٥١ |
| ٦٥ | مستەر تۆمسۆن | ١١ دیسەمبەر | مژدەبەرانی ئەمریکا رایدەگەینن کە پەیوەندییەکانیانی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئیرانیدا دۆستانەیە. لەو بارەیەوە چەند هەنگاویك لەلایەن حکومەتی ئیرانەوە نراون. | ٥١ |
| ٦٦ | کۆنسوڵی گشتی ئابۆت | ٢٣ نۆڤەمبەر | پیشکەشکردنی کۆپی سێ بروسکە سەبارەت بەکاروباری کورد بۆ وەزیری خاوەن شکۆ لەتاران. بەگویرەی هەواڵ ژنانیك کە لەلایەن سەربازانی ئیرانەوە هەلگیراون لەلایەن خزمەکانیانەوە دۆزراونەتەوە. | ٥٢ |
| ٦٧ | بۆ مستەر سەینت جۆن | ١٣ دیسەمبەر | زمانی پەسندکردن لەلایەن مستەر گۆشینەوە بۆ ئەسیم پاشا بەکاردەهینریت لە ژ. ٤٥ دا راگەیەندراوە. | ٥٣ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦٨ | کلایتـــون جیگـــری کونســۆڵ. بۆ میجـەر ترۆتەر | ٢ نۆڤەمبەر | ریرەویکـــی پروپاگـــەندە ســـەبارەت بـــە جوڵانـــەوەی کـــورد. هەولـــەکانی شـــیخ عوبەیدوڵا بۆ قایل کردنی مەسیحیەکان بۆ ئەوەی یەیوەندی ییوە بکەن. | ٥٤ |
| ٦٩ | مســـــتەر تۆمسۆن | ٢٠ دیسەمبەر | گەیشتنی سوپای ئیران بۆ ورمێ. ئیستا ســـوپای شـــیخ عوبـــەیدوڵا بەتـــەواوی یەرتەوازە بووە. | ٥٤ |
| ٧٠ | کۆنسۆل- گشـــــتی ئابۆت | ٣٠ نۆڤەمبەر | نـــاردنی کۆپـــی چـــەند بروســـکەیەك سەبارەت بە جموجولـی سـوپای روسـیا بەرەو سنوری ئاراسو هەلمـەتی ئـیرانی دژی کـورد بـۆ وەزیـری خـاوەن شـکۆ لـە تاران. | ٥٥ |
| ٧١ | مســـــتەر پلەنکیت | ١٤ دیسەمبەر | گفتوگۆکـردن لەگـەڵ مســتەر گیـبریس ســـەبارەت بـــە داگیرکـــاری کـــوردو بڵاوکردنـــەوەی هیزەکـــانی روســـیا تـــا نەخچەوان. | ٥٨ |
| ٧٢ | کـــاپتن کلایتـــون بۆ میجـەر ترۆتەر | ٩ نۆڤەمبەر | وا دەردەکـەویت بزوتنـەوەی کـورد لــە روخاندابیت. وەزعی کاروبار لە ویلایەتی وان | ٥٨ |
| ٧٣ | سـیر ئیـچ ئیلیۆت | ٢٣ دیسەمبەر | بـارۆن هاریمـەری بـەلین دەدات پشـتگیری داوای بابی عالی بکـات لـەوەی کـە دەبیـت هـەندیك لـە سـەرۆکە کوردەکـان تەسـلیم بکرینەوە. | ٥٨ |
| ٧٤ | مســـتەر ســــەینت جۆن | ٢٢دیسەمبەر | نـــاردنی دەقـــی تەرجەمــــەکراوی یاداشتنامەیەك کە لەلایەن بالیۆزی ئیران سـەبارەت بـە بابــەتی داگیرکـاری کـورد ئاراســــتەی نوینــــەرانی هــــیزە ناوبژیکەرەکان لە ئەستانبوڵ- کراوە. | ٥٩ |
| ٧٥ | مســـــتەر تۆمسۆن | ٢٩ نۆڤەمبەر | بارودۆخی مەسیحیە نەستۆرانیەکانی ورمێ ئەنجامی لیکۆلینـەوەکانی مسـتەر ئابۆت لەو بارەیەوە. | ٦٧ |
| ٧٦ | کۆســـنول ژەنــــەراڵ ئابۆت | ٤ دیسەمبەر | کۆپـی چـەند بروسـکەیەك سـەبارەت بـە هەلمــەت دژی کـــوردانو جیگـــیرکردنی هـــیزیکی روســـیایی لــە نەخچـــەوانو هەلاتنی شیخ عوبەیدولا بۆ ناوچـەکانی تورکیا بۆ وەزیری خاوەن شکۆ لە تاران | ٦٩ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧٧ | کۆنسـوڵ ژەنـەراڵ ئابۆت | ٧ دیسەمبەر | پیشکەشکردنی کۆپی چەند بروسکەیەك لە قۆناغیکی سەرەتای داگیرکاری کوردا ئاراستەی مستەر تۆمسۆن کراون. | ٧٠ |
| ٧٨ | بۆ مستەر سـەینت جۆن | ٧جەنیوەری١ ٨٨١ | بالیۆزی روسیا هیچ کاریکی ئەنجامداوە سەبارەت بە نوینەرایەتی‌یەکانی ئیران (سەیری ژ. ٧٦ بکە). | ٧٣ |
| ٧٩ | مسـتەر سـەینت جـۆن (بروسکە) | ٨جەنیوەری١ ٨٨١ | لەچەند بۆنەیەکدا وا بالیۆزی روسیا پشتگیری نوینەرەکانی ئیرانی کردوە (سەیری ژمارە ٨١ بکە). | ٧٣ |
| ٨٠ | مسـتەر سـەینت جۆن | ٤ جەنیوەری١٨ ٨١ | ناردنی کۆپی چەند بروسکەیەك بۆ جیگری کونسولی خاوەن شکۆ لەویلایەتی وان سەبارەت بە داگیرکردنی ئیران لەلایەن کوردەوەو پروپاگەندەی بڵاوی پیکهینانی کۆمەڵەیەکی کورد | ٧٣ |
| ٨١ | بۆ ئیرل دوفەرین | ٢٨جەنیوەری ١٨٨١ | گفتوگۆکردن لەگەڵ بالیۆزی روسیادا. حکومەتی روسیا دەیەویت هاریکاری ئینگلتەرا بکات لە بەرگرتن لەو بی‌نیزامی‌یەی سنوری ئیران | ٧٥ |
| ٨٢ | مسـتەر تۆمسۆن | ٣١جەنیوەری ١٨٨١ | هەوالی ئەوەی کە شیخ عوبەیدوڵا خۆئامادە دەکات بۆ هیرشی نوی‌و تورکەکانیش هیچ ناکەن بۆ ریگەگرتن لی‌ی | ٧٥ |
| ٨٣ | مسـتەر تۆمسۆن | ٢فیبریوەری | گفتوگۆکردن لەگەڵ شادا سەبارەت بەو زانیاری‌یەی لە ژ. ٨٢دا هەبووە. بۆچوونی حکومەتی خاوەن شکۆ لەو بارەیەوە. | ٧٦ |
| ٨٤ | مسـتەر تۆمسۆن | ٢٣ دیسەمبەری ١٨٨٠ | پیشکەشکردنی کۆپی چەند بەلگەنامەیەکی ساغو دلنیا ئاراستەی شیخ عوبەیدوڵا کراوە لەکاتی دوایین داگیرکاری‌دا. | ٧٦ |
| ٨٥ | کۆسـوڵ- ژەنـەراڵ ئابۆت | ٣٠ دیسەمبەری ١٨٨٠ | راپۆرتی ساختەی زیاتر دابەشکراوە لەو بارەیەوە کە بۆ ئاسانکردنی نیردەی ئەمریکایە لەگەڵ شیخ عوبەیدوڵا | ٧٨ |
| ٨٦ | کۆنسوڵ ژەنـەراڵ ئابۆت | ٣١ دیسەمبەری ١٨٨٠ | ناردنی چەند برگەیەك لە بروسکەی ئەم دوایی‌یە بۆ وەزیری خاوەن شکۆ نیردراوە لەتاران لەبارەی چەند بابەتیکی جۆراو جۆری پەیوەست بە داگیرکاری | ٧٩ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | کوردەوە. | |
| ٨٧ | مســـــتەر ســـــەینت جـــــۆن (بروسکە) | ٤ فیـــبریوەری ١٨٨١ | کاپتن کلایتــون رایدەگەیــەنیت کــە شــیخ عوبەیدوڵا خۆی ئامادە دەکات بۆ شاڵاوی نویێ بۆسەر ناوچەکانی ئیران | ٨١ |
| ٨٨ | بۆ مستەر ســـەینت جۆن | ٥ فیـــبریوەری ١٨٨١ | بۆ پشتگیری کردن لە نوینەرایەتی‌یەکانی ئیران دژی پیشـیل کردنــی سـنورەکەیان لەلایەن کوردەوە. وەڵامی ژ.٨٧. | ٨١ |
| ٨٩ | مســـــتەر سەینســت جۆن | ٧فیبریوەری | بــەگویرەی رینمایی‌یــەکانی ژمــارە ٨٨ رەفتاری کردبیت. وەڵامـی بـابی عـالی لـەو بارەیەوە. | ٨١ |